د. عەلی وەردی



# ڕەوشت

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
نزار سەلیم ـ عادل حسێن



## ونبوو لەسەرچاوە ڕەوشتییەکاندا



دکتۆر عەلی وەردی

# ڕەوشت

٧

## ونبوو لە سەرچاوە ڕەوشتیەکاندا

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

نزار سەلیم - عادل حسێن

چاپی سێیەم

سلێمانی..................2015

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی رێنما

زنجیرە(193)


**ناسنامەی کتێب**

ناوی کتێب: رەوشت

بابەت: لێکۆڵینەوە

نوسینی: د. عەلی وەردی

وەرگێڕانی: نزار سەلیم - عادل حسێن

هەڵەبڕی:هەورامان عەلی

دیزاین و بەرگ: فواد کەوڵۆسی

شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج

ساڵی چاپ: 2015 سلێمانی

نۆرەی چاپ: چاپی سێیەم

تیراژ: 1000 دانە

ناونیشان: سلێمانی ــــ بازاڕی سلێمانی ــــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل:(07701574293)،(07501191847)

## ناوەڕۆك

# پێشەکی

عـــەلی وەردی، یـــەکێك بـــوو لـــەزانا یەکەمینـــەکان کـــە هەســـتابوو بەلێکۆڵینـــەوە لەســـەر کۆمەڵگـــەی عێراقـــی لێکۆڵینەوەیـــەکی زانســـتیانەو شـــیکاریانەی مێـــژوویی، لەدەرەنجامـــەکانی ئـــەم لێکۆڵینەوەیـــە نەخۆشـــیەکان و کێشـــەکانی عێراقـــی ئاشـــکرا کـــردووەو داوای چارەســـەر کردنـــی ئەم کێشەو نەخۆشیانەی دەکرد.

چارەســـەرکردنی ئـــەم کێشـــەو نەخۆشـــیانە بـــەپێی ئـــەو بارودۆخـــەدەبێت کـــە کۆمەڵگـــە پێـــوەی دەناڵێنێـــت، وە ســـەبارەت بـــەململانێی مەزهـــەبی و (خێڵگـــەرایی) لـــەعێراق دا، عـــەلی وەردی دەڵێـــت( چارەســـەری ئـــەم کێشـــەو ململانێیـــەی کۆمەڵگـــەی عێراقـــی لـــە ڕژێمـــی دیمکراتـــی دایـــە). خوێنـــەرو لێکۆڵـــەروەی بـــاش لەکتێبـــەکانی وەردی توشـــی شـــۆك نابێـــت بـــەو بارودۆخـــەی ئێســـتای عێـــراق لـــەململانێ جۆربـــەجۆرەکان، کەئـــەو ململانێیانـــە جارێـــك شـــێوازی شارســـتانی دەشـــتەکی وەردەگرێت یاخود(خێلگەرای) یاخود سیاسی.

شێوازی ململانێ جۆربەجۆرەکان لەم قۆناغەدا لەچوارچێوەی ململانێ لەسەر دەستەلآت دەرناچێت هەروەکو وەردی دەڵێت(ئەو کەلەپورە کۆمەلآیەتیەی کەلەعێراقدا باو بوو بە دوو بابەت جیا دەکرێتەوە توند ڕەوی و بلآو بونەوەی دەشتەکی، لەڕاستیدا هەردوکیان دووڕوی یەك شتن خێلگەرایی ئاین نیە بەلکو جۆرێکە لەئینتمای هۆزایەتی بۆ مەزهەبێك یان بۆ کەسێکی دیاری کراو، وە تاکی خێلْ کاتێك دەمارگیر دەبێت بۆ مەزهەبەکەی گوێ ناداتە ئەو پرەنسیپە ڕەوشتی و ڕۆحیانەی کەلەناو مەزهەبەکەیدا هەیە ئەمەش لەدەرەوەی بیر کردنەوە یەتی، وە ئەوەی گرنگی پێدەدات تەنها دەمارگیریەتی بۆ پابەند بون بەخێڵەکەیەوە یان دژایەتی کردنی بەرامبەر. بە جۆرێکی تر سەیری خێڵەکەی دەکات وەك چۆن دەشتەکیەك سەیری هۆزەکەی دەکات هەروەها وەردی دەڵێت: (نکۆڵی ناکرێت لەوەی کەلەعێراق دا ڕویدا لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا ئەو بارودۆخە لە هەر ولآتێکی تردا ڕودەدات کاتێك بە قۆناغێك دا تێدەپەرێت کە دەستەلآتی حکومەتی تێدانی یە، بەلآم ئەوەی لەعێراق دا ڕوی دا جیاوازە لەوەی کەلەولآتانی دیکەدا ڕودەدات) لەشێوازە دەشتەکیەکەی دا کە عێراقی پێ جیا دەکرێتەوە وەتالآنچیەکان لەعێراقدا زۆر بەیان هێرشەکانیان بەرەو دام و دەزگاکانی دەوڵەت دەبرد پێش هەر شوێنێکی تر،وەك بلێ ی دەیانەوێت تۆڵەی خۆیان لەحکومەت بکەنەوە، وەلەتالآنی کردن دا

کەسانێکی بەرێز بەشدار دەبن کە هیچ جیاوازیان لەڕوی ڕەفتارەوە
نی یە لەگەڵ کەسانی دەست بڕدا ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شێوازی
ئەو بەهاکۆمەڵایەتیانەی کە لەنێوان خەڵکی عێراقدا باوە.

## عەرەب: عەلی وەردی دەدۆزێتەوە

رۆشنبیرانی عەرەب توشی شۆك بوون بەشێوازوو توندی ئەو ململانێ یەی کە لەعێراقدا هەیە لەماوەی ئەو چەندساڵە رابووردوانەدا( واتە لەدوای روخانی رژێمی سەدام حسین)موە، ومبەشێکی گەورەی رۆشنبیرانی عەرەب لە هۆکارەکانی ئەم ململانێ یە دەکۆڵنەوە و کتێبەکانی وەردی یارمەتی دەریان بوون بۆ تێگەیشتنی سرووشتی ئاڵۆزی عێراق.

*بلاوکەر(الناشر)*

# پێشەکی وەرگێڕ

عەلی‌وەردی، یەکێك بوو لەتوێژەرو کۆمەڵناسە بەناوبانگەکانی سەدەی ڕابردوو کە توانی زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی لەسەر کۆمەڵگەی عێراقی بەتایبەتی و کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست بەگشتی چڕبکاتەوە، بەجۆرێك کەتوێژینەوەکانی بوونە هەوێنێك بۆ زۆر لە لێکۆڵەرو توێژەرەکان کە بیانەوێت لەسەر زۆر لایەنی کۆمەلایەتی وەکوخێڵگەری وشەڕی ئاین و دووفاقیەتی وهەروەها قسەکرد لەسەر دەشتەکیەتی و لایەنی ڕۆحی تاکی عەرەب وعێراقی قسە بکات. عەلی وەردی تەنها لەلایەنی کۆمەڵناسیەوە کاری نەکردووە بەڵکو دەروونناسێکی بەتواناش بووە لەبواری لێکۆڵینەوە لەسەربابەتەکانی ڕۆحی ودەرونی مرۆڤناسی بۆیە عەلی وەردی توانی لەوباروودۆخەناڵۆزەی عێرقدا شۆڕێکی فەرهەنگی وڕۆشنبیری بەناوبانگ بەرپابکات. سەرەڕای ئەو باردودۆخە ئاڵۆزەی سەردەمی وەردی لەڕووی دواکەوتوویی

کۆمەڵگەی عێراقی بەگشتی و بابەتە سیاسیەکان بەتایبەتی، عەلی وەردی لەکاتی ژیانی دا توشی ئازارو ڕەخنەی توند بوویەوە لەلایەن کاربەدەستانی سیاسی ویەکێ گیراوانی حکومەتەوە تەنانەت لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا لەگەڵ سەدام حسین بەم شێوەیە وەردی ستایش دەکات کەتوشی(شیزۆفرینا) بووە لەگەڵ ئەوەش دا دوای مردنیشی وازیان لێ نەهێناو توندڕەوەکان گۆڕەکەیان هەڵکەندەوە سەرەڕای ئەوهەمموو خزمەتەی کەکردی بەکۆمەڵگەی عەرەبی وعێراقی، ئەمڕۆکە کۆمەڵگەی کوردی زۆر پێویستی بەکەسانی پسۆڕ هەیە لەبوارەکانی توێژینەوە جۆر بەجۆرەکان، کە بتوانن بەڕاشکاوانەو بەبێ ترس و دوور لەهەموو دووڕوویی یەك بچنە قوڵای کێشە جۆر بەجۆرەکانەوە. ئەوەی کەعەلی وەردی باسی لێوە دەکات کۆمەڵگەی کوردیش لەتایبەت مەندی دێهاتی ودەشتەکی خێڵگەرای خاڵی نی یە بۆیە تاوەکو ئێستاش خێڵ وهۆزە جۆر بەجۆرەکان لەنێو چوارچێوەی دەستەلات وبەرپرسیاری دا نمایشی خۆیان دەکەن لەژێر دەمامکی خێڵێك یان هۆزێك. عەلی وەردی زۆر بابەت هەیە باسی لێوە کردوە، بەشێوەیەکی تایبەتی دەتوانین بڵێین وەردی لەسەر سێ گریمانەی سەرەکی کاری کردوە(ململانێی دەشتەکی وشارستانی یەت)یان( کەسایەتی دووفاقی)(یان ناسازی کۆمەلایەتی) توێژینەوەکانی ئەنجام داوە لەبەر ئاسانی وچڕی توێژینەوەکانی

کتێبەکانی وەردی بۆ سەر زۆر زمانی زیندوی جیهان وەرگێڕدراون، وائێمەش ئەم کارەی وەردی بۆ سەر زمانی کوردی خۆمان وەردەگێڕین هیوادارم توانیبێتمان خزمەتێکی بچوك بەکتێبخانەی کوردی بکەین

ئەم وەرگێڕانە بریتییە لەکتێبێکی عەلی وەردی لە ژێرناونیشانی (ڕەوشت) لەگەڵ کۆمەڵێك لەو چاوپێکەوتنانەی کەلەگەڵ وەردی دا سازکراون لەدیاسپۆڕادا و لەناوخۆی ولآت دا کە لەکۆمەڵێك ماڵپەڕی بەناوبانگی عێراقی یەوە وەرمان گرتوون، ئێمەش لەبەر گرنگی چاوپێکەوتنەکانی و دەرخستنی هەندێك بابەتی نوێ بەباشمان زانی وەریان گێڕینە سەر زمانی کوردی و لە دوو توێ ی ئەم کتێبەدا بلآویان بکەینەوە. بۆیە هەندێك لەو ووتارانەمان خستۆتە پێشەکی کتێبەکەوە، بۆیە داوای لێبوردن لەوخوێنەرە بەرێزانە دەکەین وهیوادارم لە هەڵەو کەم وکورتیەکانمان ببوورن.

عادل حسێن بەڵخەی هەورامان
2009|3|20

# لەیادی کۆچی دوای بیرمەندی عێراقی فەیلەسوف عەلی وەردی دا

مهند حسینی

**لەنێوان هەڵەیەکی بێتاوان و...... رق لێبوونێکی گەورەدا !!!!!**

ئەوە مانگێك تێپەڕی بەسەر یادی 13ساڵەی کۆچی دوای فەیلەسوفی کۆمەڵناسی عێراقی عەلی وەردیدا، کە ڕێکەوتە بە ڕۆژی 1995/7/13دا ئەو پیاوە کەبنچینەی زانستی دارِشت بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کەسیەتی عێراقی وە یەکێکە لەدامەزرێنەرانی هۆشمەندی هزری و کۆمەلآیەتی لەرۆشنبیری عەرەبیدا.

وامەزانی کەمن لەم بۆنەیەدا دوادەکەوم بەلآم ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە کە زیاتر لەمانگێك تێپەڕی و وەئەم بۆنەیە بەشێوەیەکی ڕەسمی یادنەکرایەوە یاخود لەسەر ئاستی پێویست نەبوو.

هەندێك لە ڕۆشنبیران کە لەسەر کەسانێکی سومبولی عێراقی دەنوسن تەنها لە چوارچێوەیەکی تەسك و سنورداردا لێرەو لەوێ، تەنها وەکو لەکۆڵکردنەوەی ئەرکێك وەکو بڵێن ئەم بیرمەندەگەورەیە، هیچ

نەبێت یاخود یا کەسێك بێت کە پاشخانێکی ڕۆشنبیری و زنجیرەیەك هزری پێشەنگی بەجێنەهێشتبێت و تاریکی ڕێگامانی ڕوونکردبێتەوە،

دەپرسم بۆچی هەمیشە دەست ئەنقەست یا خود بەهەڵە سومبولەکانمان یان کەسە گەورەکانمان لەبیر دەچێت یان بیرمەندە گەورەکانی هزر تەنانەت کەسە گەورەکانی بواری ئەدەب بەکەم دەزانین، لەکاتێکدا کە ڕۆشنبیرانی ولاتانی تر ئەم بیرمەندانانە بە گەورە دەزانن و ڕۆشنبیری عێراقی هیچ نەیتوانیوە نرخ و ڕێز بدات بە ڕۆشنبیرانی ولاتەکەی وەکو خەڵکی ولاتانی دیکەی عەرەبی کە چۆن ڕێز و ناوی بەرێز و گەورە دەخەنە پاڵ بیرمەندەکانیان بۆ نمونە فلان کەس(میری شاعیرانە) و ئەوی دی ئەستێرەی ڕۆژهەلاتە و یەکێکی دی پادشایی هزرە و ئەوی دیکەش قەیسەرە هیتد، من لێرەدا تەنها قسە لەسەر لایەنە ڕەسمیەکان ناکەم کە پێویستە دەستپێشخەربن. لەم بوارەدا بەهۆی بوونی چەندین دامەزراوەی پسپۆڕی دەوڵەتی لەبواری ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری کە ڕۆڵی سەرەکیان بریتیە لە زیندووکردنەوەی ئەو جۆرە بۆنانە بەشێوەیەکی ڕەسمی بەلام با ئەو کەسانە بخەینە لاوە واتە لایەنی ڕەسمی چونکە دەکرێت نوسینەکانیان پشتگوێ خستبێت چونکە بووەتە هزی دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەیان، پێش ئەوەی گەلەکەیان بیانناسن. وە چۆن بەشێوەیەکی ناشیرین بازرگانی بەناوی دین و بەناوی گەلەوە دەکەن. قسە لەبەردەکەن بەبێ ئەوەی جێبەجێی بکەن، بەبێ هیچ دوودڵێیەك ئەمانە بازرگانی قسەکردنن.

عەلی وەردی لەبارەی دوو ڕووی و درزیانەوە دەنوسێت چۆن ئاینیان کردوەتە هۆکارێك بۆ جێبەجێکردنی مەبەستیەکانیان، کە تەنها پێویستی بە زمانێکی درێژ و مێژەرەیەك و عەبایەکی درێژی پیس دەبێت.

بەڵێ با واز لەو کەسە دڵ ڕەقانە بهێنین، کەلەسەر عەلی وردی دەنوسن ئەو کەسانەی کە باش دەزانین ڕقی تایبەتیان لە عەلی وەردی یە هەڵوێستیان ناکۆك و جیاوازە لەگەڵی با دەست بە لێپرسینەوە لە خۆمان بکەین، وەك ڕۆشنبیرو پرسیار لەخۆمان بکەین بۆچی ئەم بۆنەیەمان لەسەرتێپەڕی.؟؟؟!!!!!

ئایا ئەوە ئێمەین کە گەواهی دەری بیری ڕوناك و ووشەو پێگەی عەلی وەردین، ئایاسەرکەوتووبوین بە پاداشت دانەوەی ئەو کەسەی کەخاوەنی گەورەیە بەسەرمانەوە وەك ئەو کەسانەی کە هەمەو نوسینەکانیمان پیادەکردووە وڕێنوێنیمان لەبیری وەرگرتووە لەزۆربەی نوسینەکانماندا.

زۆربەی ڕۆشنبیرانی عەرەب وتەنانەت زانایانی کۆمەڵناسی ڕۆژئاوا ئەم یادەیان کردووەتەوە بەبێ ئێمە(مەبەست عێراقی)ئایا عەلی وەردی وەکو ئەوپاشماوە شوێنەوارییانەی لێ هاتووە کە لە زۆربەی مۆزەخانەکانی جیهاندا پیشاندەدرێت لە جێگەی مۆزەخانەکانی خۆماندا ؟

لەیادی 13 ساڵەی کۆچی دوای عەلی وەردیدا ڕۆژنامەی(شرق الوسگ) ی لەندەنی دەنوسێت(کە عەلی وەردی نمونەیەکی زیندووە لەسەر

کاری ڕۆشنبیری ئیجابی وبوێری فکری وتوانای بەرپەرچ دانەوەی دامەزراوەکۆمەلآیەتی وفکری و تەقلیدیەکان ودامەزراوە نوێ یەکان کە دەیان ویست بازیدەن بەسەر واقعی کۆمەلگەی عێراقی بەبێ سەرکەوتنی پێشنیارەکانیان کە بووە هۆی دەرەنجامی هەڵە. د. عەلی وەردی شەرە ڕوناك کەرەوە گەورەکەی ئەنجام دا بە بێ پشت بەستن بە دەستەلآتی فەرمان ڕەوایان و مەرجەعی سیاسی یاخود حیزی یا خود بزوتنەوەیەك بەلکو وەردی پشتی بە بەجەماوەر بەستبوو کەچووبونەسەر(قوتابخانە فکریەکەی)کە خوێنەرو موریدو لایەنگرانی گرتبووە خۆ کەلەپێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەلگەی عێراقی پێك هاتبوون ئەم جەماوەرە کاریگەر بوون پێی ئەگەر ناکۆکیش بوونایە لەگەلی، ئەگەر ڕەخنەشیان لێ بگرتایە ئەوا بوێری عەلی وەردی بووبوویە نمونەیەك بۆیان لە مشت ومڕەکان وخۆبەدەستەوەنەدان یاخود مل کەچ نەبوون لەبەرامبەر فەرمانڕەوا یاخود دەستەلات دا.

بەلآم لەهەمان کاتدا ڕۆژنامەی(الصباح) ی بەغدادی چی دەربڕیوە لەم بۆنەیەدا؟!( ئەگەر وەردی خەلکی میصر یان هەر ولاتێکی تری جگە لەعێراق بوایە بیرتان لەوە دەکردەوە کە لە ڕۆژی 13ی تەموزی هەموو سالێك چی ڕویدەدا ؟؟

بەبێ هیچ زیادەڕەویەك کۆڕی ڕۆشنبیری ئێوارە شیعرمان دەبینی کە یادەکەیان پێ پیرۆز دەکرد هەروەها ئەلقەی گفتوگۆی فراوانمان دەبینی لە پەراوێزی گریمانە کۆمەلآیەتیەکانیانەوە کە بەدرێژای ئەو مانگە ئەنجام

دەدرا وە پێش برکێ بەناوی وەردیەوە ئەنجام دەدرا.(تەنانەت پێش برکێی وەرزشیش بۆچی ئێمە کەم تەرخەمین بۆ بیرمەندەکانمان لەوانەش وەردی؟ بەلاّم بەداخەوە نکۆلّی لە سیمبولّە نەمرەکانمان دەکەین و پەنا دەبەینە بەر ئەفسانەکان نکۆلّی لە فەیلەسوفەکانمان دەکەین وەدەست دەگرین بەفکرو بیری کۆمەلّێك نەزانەوە کەهیچ مەعریفەیەك یان پێنیە جگە لەبواری(خۆپاك کردنەوەو پیس بوونی لەش) ەوە وە چۆن پێغەمبەر رۆشتوە بەرێداو وە چۆن گرنگی بەریشی داوەو وە چۆن دوژمنەکانی سەربریوەو روخساری پێکەنیناوی بووە ؟؟؟ ئایا نمونەی ئەم کەسانە دەبێت بەرز رایان گرین ووەکو نمونەیەکی بەرز سەیریان بکەین لەکاتێك دا ئەو کەسانەی جێ پەنجەیەکی نەمریان بەسەرمانەوە هەیە لە یادیان ئەکەین .

پێمەوایە کات وەلاّمی ئەم پرسارە دەداتەوە. هیواداریشم ئەم وەلاّمەش دوور نەبێت زانیارێکی زۆر گرنگ هەیە کە ئەوەیە وەردی تەنها نوسەرێکی عەرەبیە کە خاونی پڕ فرۆشترین کتێبە تەنها کەسێکە کە چاپکردنەوەی زیادەی کتێبەکانی رەت دەکاتەوە و هەرخۆی زیادەی کتێبەکانی دیاری دەکرد. یان بە واتایەکی تر. عەلی وەردی. گوێی نەدەدا پارە ئەوەندە کە مەبەستی گرنگیدان بوو بە گەیشتنی. بیروبۆچوونەکانی بە خوێنەر، ئەوەندەی وەردی بەبێسنور. هزری بەخشی بە خوێنەری عەرەبی هیچکەسی دیکە ئەوەندە هزری نەبەخشیوە تەنانە توشی تەنگپێهەلّچنین بوو. لە سەردەستی هەموو ئەو دەستەلاّتە یەك لە دوایی یەکانە کە فەرمانڕەوایی عێراقیان دەکرد هەر لەسەردەمی پادشایەتیەوە

تاوەکو کۆمارییەکان، تەنانەت سەدامی دیکتاتۆریش لەسەر تەلەفزیۆن تاوانباری کردوە بەوەی کە توشی شیزۆفرینیا بووە، تەنهای بەبۆنەی ئەوەی وەردی کەسێکە نەخۆشیە ڕاستەقینەکەی کۆمەڵگەی عێراقی بەشێوەیەکی تایبەتی و کۆمەڵگەی عەرەبی بەشێوەیەکی گشتی دەرخستووە.

سەرەتا ئەوڕاستییەی بەخۆیی گەیاند کە دواتر چارەسەرکردنەکەشی بەشوێنیدا دێت، بۆ ئەم نەخۆشیە بەربڵاو و درێژخایەنە ئایا پێویست ناکات، بەلایەنی کەم کە هەندێك لە سوپاس وپێزانینەکانمانی بۆ دەربڕین لە ڕێگەی یادکردنەوەی ئەم بۆنەیەوە، قسە و پێشنیازەکانی سەرۆك کۆماری عێراق(جەلال تالەبانی) لەکۆین کە پێش سێ ساڵ لەمەوبەر بڕیاریدا بە دووبارە چاپکردنەوەی تەواوی نوسینەکانی وەردی و دامەزراندنی مەڵبەندێکی زانستی بەناوی وەردی یەوە.

یاخود، ئەمە هەرقسەیە و دەچێتە چوارچێوەی ئەو قسانەی تردوە، کە دەکرێت، بەبێ جێبەجێکردن بێننەوە؟؟! ئایا بەلایەنی کەمەوە وەردی شایەنی ئەوە نیە کە یەکێك لەزانکۆکانی عێراقی بە ناویی ئەوەوە بێت، و پەیکەری یادگاری بۆ دروستبکرێت لە شاری بەغداد، کەسایەتی وەردی باشترە لە کەسایەتی سەعدون، کە شوێنێکی گەورەی داگیرکردوە. ئەو تەنها کەسێکە کە بانگەشەی بۆ نیشتیمان پەروەری کردوە، لەکاتێکدا کە نیشتیمان پەروەری لێی بێ بەریە،(من نامەوێت بچمە ناو باسکردنی نیشتمان پەروەری سەعدونەوە کە لە خوێنەرانی مێژووی عێراقی نوێ

شاراوە نی یە، یان بۆچی شوێنی(عەبدل موحسن کازم)ی ناگرێتەوە لە شاری بەغداد کەهیچی بەخەڵکی عێراق پێشکەش نەکرد، ئەم خاوەنی گۆچان و مێزەرەیە لەوانەیە ئەوەی کە پێشکەشی کردبێت تەنها، کۆمەڵێك وشەی بەتاڵی درۆ بێت کە هیچ سودێکیان نی یە، بەڵێ دکتۆر وەردی شایستەی ئەو پەیکەرەیە لەو شوێنەدا !! بۆ دەربڕینی پێزانینی خۆمان بۆ ئەوەی هەموو کەس وەردی بناسێت وبزانێت ئەو کەسەی کە گاڵتەی کرد بە کتێب و پەڕەی کتێبەزەردەکان کە عەقڵ تێیاندا ئامادە نیە و عەقڵ توشی گێژی دەکات وەردی بوو!!

ئەڵێم و بەرپرسیارم لە قسەکانم، یادی وەردی زۆر باشترە لە کاغەزی سەر دیوارەکان هەر لەباشورەوە تاوەکو باکور کە هەڵگری وێنەی کەسانێکی نەناسراون کە جگە لە ناتەوەی ئاژاوە هیچی دیکەیان بۆ عێراقیەکان نەهێناوە. ڕێزی مرۆڤیان شکاند کە مایەی گاڵتە و پێکەنی نە لەلایەن هەرکەسێکەوە کە شارەزایی شارستەنیەت بێت، کەی دەزانین کە پیاوان بە قسە وبەکردار بپێوین؟ کەی هەست بە واقع دەکەین دوور لەکاریگەریەکانی کەڵەکەبوونی ڕابردوو؟ کەی فێری خوێندنەوەی مێژوو دەبین بەبێ پیرۆزی ناوەکان؟؟! دەبێت قسەی ئامۆژگاری ڕەد بکەینەوە، کە بەراستی بێزمان لێ ی دەبێتەوە، ئەو کەسانەش کە ئەم قسانە دەکەن دەزانن مەحاڵە کە قسەکانیان جێ بەجێ بێن.

خراپە بە ئامۆژگاری هەڵناوەشێتەوە هەرچەندە بڵێین و هەرچەندە هاوار بکەن،(مرۆڤەکان ناگۆڕێن تەنها بەگۆڕانی باروودۆخیان نەبێت ئەمە

ڕاستیەکەو وەردی جەختی لەسەرکردوەتەوە، ئایا پیاوی ئاینی تەنها هەوڵێکی داوە بەشێوەیەکی کرداری بۆ گۆڕینی باروودۆخی خۆی پێش ئەوەی داوا بکات لە جەماوەر بۆ گۆڕانی خۆیان! بە قسەی پەشیمانی و بریقەدار؟ سودی پیاوی ئاینی چی یە لەم کۆمەڵگەی ئێمەدا کە تێیدا منداڵی شیرە خۆرە بوتە موفتی و وتاربێژ.

لە کۆتایی دا پرسیار لە سەرانی حکومەتەکەمان دەکەم لەبارەی کەم وکوڕیان لەیادی، مردنی (وەردی) دا، ئایا ئەمە هەڵەیەکە لە ئێوەوە، یا خود، تۆڵە سەندنەوەیە لە خودی (وەردی).

زاناوکۆمەڵناس((عەلی وەردی))لەکازمی یە ساڵی 1913 لە دایك بووە، هەر لەوێش گەورەبووە،حەزی لە خوێندنەوەی گۆڤار و کتێب بووە ناچار بووە واز لە خوێندنی قوتابخانە بهێنێت لە دوکانەکەی باوکی دا کار بکات دواتریش بۆ کارکردن لە دوکانێکی بۆن فرۆش کاری کردوە، بەلاّم لە کارەکەی دەرکراوە، چونکە سەرگەرمی گۆڤارو کتێب خوێندنەوە بووە، وکڕیارەکانی پشتگوێ خستبوو، دواتر گەڕایەوە بۆ قوتابخانە خوێندنی تەواوکردوە و بووەتە مامۆستا. لە دوای ساڵی 1932 جل و بەرگە تەقلیدیەکە گۆڕی و بوویە مامۆستا(ئەفەندی) لە ساڵی 1943 حکومەتی عێراق دەینێرێت بۆ بەیروت لە زانکۆی ئەمریکی، بڕوانامەی ماجستێری بەدەستهێناوە، هەروەها دکتۆرای لە زانستی کۆمەڵناسیدا لە

زانکۆی تەکساسی ئەمریکی دا بەدەست هێناوە، دوایی گەڕانەوەی لە زانکۆی بەغداد لە بەشی کۆمەڵناسی دەستبەکاربووە، تاوەکو کاتی خانەنشین بوونی تاوەکو ساڵی 1970 لە 13 تەموزی 1995 دا کۆچی دوایی کردوە، وەردی هەژدە کتێبی نوسیوە و بەسەدان لێکۆڵینەوە و وتاری هەیە، پێنج کتێب یان پێش شۆڕشی چواردەی تەموز نوسراون لەسەردەمی پادیشایەتی دا شێوازێکی ئەدەبی ڕەخنەیی و ناوەڕۆکی ڕەخنەیی و ناوەڕۆکی ئەدەبیان لە خۆگرتبوو کە بۆ خوێنەرانی عێراقی شتێکی نوێ بوو، بەڵام ئەو کتێبانەی لە دوایی شۆڕشی 14 تەموز دەرچوون شێوازێکی زانستیان وەرگرتبوو، پرۆژەکەی وەردی بۆ دانانی گریمانەیەکی کۆمەڵایەتی، لەبارەی سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی یەوە، لە پێش هەموویانەوە لێکۆڵینەوەیەك لەسروشتی کۆمەڵگەی عێراقی( لۆژیکی ابن خەلدون و کورتەی کۆمەڵایەتی لە مێژووی عێراقی نوێ لە هەشت بەرگ دا، ئەم کتێبانە لەکاتێك دا نوسیبووی کە بیری (چەپ) باڵی کێشابوو بەسەر کۆمەڵگەی عێراقی دا، لەگەڵ سەرهەڵدانی بیری ئاینی و نەتەوەی، لەهەموو کتێبەکانی دا لە هەموو بیرە سیاسی و ئایدۆلۆژیەکان لەنوسینی کتێبەکانی دا دوور بووە وەك بڵێیت زۆر ڕاستگۆ بووە لەسەر ئەو میتۆدەی کە کاری لەسەرکردوە، بەلێکۆڵینەوەی سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی دەستپێکردوە بەپێی گریمانەکەی، هەروەك

یەکێك لەقوتابییەکانی بەناوی(حەیدەری)دەڵێت: لە سێ سەرچاوەوە عەلی وەردی کاری کردوە:

1- بەزانای کۆمەڵگەی ئەمریکی(مەکایفەری)

2- زانای بەناوبانگی عەرەبی(ابن خلدون)

3- بەزانای بەناوبانگی ئەمریکی(ئوگبەن) دەستی پێکردوە لە بەهاکانی دەشتەکی و شارستانیەتی لە کۆمەڵگەی عیراق. ئەم بەهایانە کاریگەریەکی زۆریان هەبووە لە سەر کەسێتی تاکی عێراقی و سروشتی دووفاقیەتی کەسیەتی عێراقی، بەهۆی ئەوەی جارێك ڕێز لە مێوان دەگرێت و جارێکیش تالانی دەکات، جارێك بانگەواز بۆ چاکە دەکات و جارێکیش خەڵکی تالان دەکات و دەیانکوژێت، نمونەی ئاسان هەیە کە میتۆدە مێژوویەکەی بەهێز دەکات لە لێکۆڵینەوەدا. کاتێك هەندێك کەس ڕەخنەیان لێگرت، وازیان لەسەرژمێریەکان هێنا لەناو کتێبەکانی دا بەوپێی یەی کە لەزانکۆکاندا خوێندویەتی. ئەوانەی کە ڕەخنەیان لە وەردی گرت وەلامیان نەوەبوو، کە کۆمەڵگەی عێراقی جیاوازە لە کۆمەڵگەی ئەمریکی، هێشتا ترس ماوە لە ئەفەندی کە قەڵەم و دەفتەرێکی وەرگرتوە و چۆن پرسیاری ئاراستەی کۆمەڵگەیەك کردوە کە، نەخوێندەواری تێدا بلاوە، لەگەڵ دابوو نەریتە کۆنەکان.

لەبەرئەوە میتۆدە نوێیەکەی کاریگەر بووە کە دەستپێشخەربووە تیی دا، وەردی هیچ نەبووە تەنها لێکۆڵەرێك لەوپاسایانەی کەبوونە هۆیی

جیاوازی کۆمەڵگەی عێراقی لە کۆمەڵگەکانی تری عەرەبی و دەوروبەر، زۆر دەگەرا بەشوێنی. ئەو هۆکارانەی کە دەبوونە هۆی مشتومڕی عێراقی، تەنانەت نازناوی ناو نرابوو بە وڵاتی دووڕوی و دووبەرەکی. سەرەڕایی ئەوەی کە ئەمانە تایبەتمەندی ڕەسەن نین لە کۆمەڵگەی عێراقی دا، لەو هۆکارە گرنگانە بۆ ململانێی نێوان خەڵکی عێراق بۆ مشتومڕ، کەلەپووری عێراقی شێوازێکی نموونەی وەرگرت دوور لە واقعی بەرجەستەبوون، لەبەرئەوە جیاوازیەك دەرکەوت لەنێوان، بیرکردنەوە و جێبەجێ کردنی کرداری دا. وەردی زانی کە کۆمەڵگەی عێراقی پێویستی بە لێکگەیشتن هەیە لەنێوان بیروباوەڕە جیاوازەکان. بۆ دەسەلات، تەنها ڕێگەیەك بۆ بنیادنانەوەی کۆمەڵگەیەکی نوێ بریتیە لە دیموکراتیەت، کە وەردی بە تەنها چارەسەرێك بۆ کێشەکانی عێراقی دەزانێت.

پاشکۆی عێراقیەکان کە ڕۆژنامەی(مەدا) دەری دەکات، لە یەکەم ژمارەی دا هەوڵ دەدات تیشك بخاتە سەر کەسایەتی یە عێراقیەکان، ئەوانەیان کە بەشداریانکردوە لە بنیادنانەوەی، ڕۆشنبیری و شارستانیەتی ئەم وڵاتە، وەردی یەکێکە لەو کەسایەتی یە دیارانە.

## ونبوونی سەرچاوە ڕەوشتیەکان

ئەم بابەتە کەئەمڕۆباسی لێوە دەکەین جیاوازە لەسروشتی دا لەگەڵ بابەتەکانی تر، کەلێژنەی لێکۆڵینەوەی عەرەبی داوای لێکردون کە گوێی لێ بگرن. بابەتەکەمان پەیوەستە بە ڕەوشتەوە هەروەك و دەزانن ڕەوشت یەکێکە لە ڕەهەندە ڕێژەیی یەکان کە خەڵکی جیاوازن لە نواندنی دا، ڕەوشت وەك سەرچاوە تەندروستی وتەکنیکی و ئابوریەکان نی یە کە خەڵکی کۆك بن لەسەر بڕیار دانی باش و خراپی. بۆ نمونە خەڵکی کۆکن لەسەر ئەوەی کە نەخۆشیەکان بە هەموو جۆرەکانی یەوە بەڵایەکەو توشی مرۆڤ دەبێت، وەخۆپاراستن لەو نەخۆشیانە مرۆڤ هەمیشە هەوڵی بۆ داوە زۆربەی بیروو بۆچونی خەڵکی دەربارەی خۆپاراستن وەك یەکە، بەڵام بەهەمان بیرو بۆ چون ناڕواننە ڕەوشت. واتە بەڕوانینێکی جێگیر، ڕاستر وایە بڵێین کە هەموو ڕۆشنبیەی مرۆیی پرەنسیپێکی ڕەوشتی تایبەت بەخۆی هەیە کە دەڕوانێتە ڕەوشتی ئەوانی دیکە بەشێوەی گومان و ڕق لێبوونەوە.

وە لەبەر ئەوە پێویست بوو لەسەرمان پێش باسکردن لە(وون بوون) لەرەوشتی عەرەبی دا، ئەو بنچینانە بزانین کە کە ئەم باسانەی لەسەر بنیاد نراوە. بەشێوازێکی دیکە پێویستە بزانین رەوشت چی یە پێش ئەوەی بزانین(وون بوون) کێیە یە تێی دا ؟

وە لەپێناو سەرچاوەیەك کەپشتی پێببەستین وگرنگی پێبدەین بۆ کایەکانی ئەم بابەتەهەوڵ دەدەم بەراوردێك بکەم لەنێوان رەوشتی دەشتەکی و رەوشتی شارستانیەت، ئەویش هۆکارێك هەیە پاڵی پێوەنارین بۆ بەراوردکردنی نێوان ئەم دوو چەمکە چونکە کۆمەڵگەی عەرەبی جیاوازە لەنێوان زۆرێك لەکۆمەڵگەکانی دیکەدا. جیاوازە لەوەی کە پەیوەندیەکی پتەوی هەیە بە دەشتەکی لەلایەك وەکۆنترین نیشتمانی شارستانیەتەکان لەلایەکی دیکەدا.

جێگەی داخە لەم بارەیەوە زۆرێك لەلێکۆڵەرانی عەرەب گرنگی یەکی پێویست نادەن بەم لایەنانەی کۆمەڵگەکەیان وە لێکۆڵینەوەکانی رۆشنبیرانی عەرەب لەسەر کۆمەڵگەکەیان دەبینبن هەروەك چۆن رۆژئاوایەکان لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگەکانی خۆیان دەکەن، شایانی باسە کە کۆمەڵگەی عەرەبی جیاوازە لە کۆمەڵگەکانی رۆژئاوا لەکەلەپوری رۆشنبیری وشارستانیەتیاندا، کەواتە پێویستی بەمیتۆدێکی لێکۆڵینەوەی تایبەت بەخۆی هەیە. پێویستە پێش هەموو شتێك ئەوەمان لەبیر نەچێت کە وولاتانی عەرەبی دەکەونە گەورەترین ناوچەی بیابان لەجیهاندا. ئەگەر سەیر بکەین سەراکیش لەرۆژئاواوە تاوەکوو عێراق

لەرۆژهەلات دەبینین بیابانێكی فراوانی تێدا كشاوە تارادەیەك جێگەی ئاماژەیە مێژووی ئەم ولاَتە پڕ بووە لە شەپۆلی مرزیی ئەوە لە دوای ئەوە.

شیاو نیە كەكاریگەری بیابان لە سەر پێكهاتەی.كۆمەلگەی عەرەبی پشتگوێ بخەین. وە سەرزەنشتی رۆژئاوایەكان ناكەین ئەگەر كاریگەری بەها دەشتەكی یەكان لە كۆمەلگەكەیاندا پشت گوێ بخەن. *لەبەر ئەوەی ولاَتەكانیان تارادەیەك بێبەشن لەبیابان وەكەلەپورێكی دەشتەكیان نیە، بەلاَم عەرەب بەها دەشتەكی یەكان بەشێكی گرنگ لە رژێمی كۆمەلاَیەتیان پێك دەهێنن، بە بیرو بۆ چونی ئێمە ناتوانین لە رەوشتی عەرەب بگەین لە بارو دۆخی ئێستای دا مێنش ئەوەی لێكۆڵینەوە بكەین لەسەر رەوشتی باو باپیرانی دەشتەكی یان بۆ ئەوەی بزانین ئەوان چۆن دەیان روانی بۆ كارو بارەكانی ژیان.*

# کەسایەتی کۆمەڵگەی دەشتەکی

بائێستا لێکۆڵینەوە لەسەر کەسیەتی کۆمەڵگەی دەشتەکی بکەین وە لێرەدا دەڵێم کەلێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتی یە نوێکان وادەبینن کە هەرکۆمەڵگەیەك لەکۆمەڵگە مرۆییەکان وەك تاك وایە خاوەنی کەسیەتی تایبەتە بەخۆی، وە ئەم کەسیەتی یە کۆمەڵایەتی یە لەزاراوەی زانستی دا بەکەلتور ناسراوە(culture).ئەگەر لە دەشتەکی یەت بکۆڵینەوە لەم چوار چێوە یەدا ئەنجامێك مان دەست دەکەوێت کە جیاوازە لەئەنجامەکانی دیکە، کە گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسەکانی دیکە پێی گەیشتون کە لەدەشتەکیان کۆڵیوەتەوە. لەم سەردەمەی ئێستادا کێشەی ئەم لێکۆڵەرانە ئەوە بور کە باسی ئەو تایبەتمەندیانەیان دەکرد کە دۆزیبویانەوە لەکۆمەڵگەی دەشتەکی دا، شان بەشانی یەك، بەبێ ئەوەی بگەڕێن بەشوێن هۆکاری هاوبەش کە لەپشت ئەم هۆکارانەوە خۆیان حەشار داوە. بەشێوازێکی دیکە ئەوان هەروەك لەکەسێك بکۆڵنەوەو باس

لەسیفەتە جۆر بەجۆرەکانی بکەن بەبێ ئەوەی باس لە شێوازی کەسیەتی بکەن کەلەو سیفەتانە ریتمێکی جوڵەی پتەوی پێك هێناوە.

(روسبندکت) لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی دا دەڵێت(کە صیفات لە هەر کۆمەلگەیەك دا وەك و ئەو رەگەزانە وایە کەپێك هاتەیەکی کیمیایی لێ پێك دێت کەکارلێك دەکەن و وەپێکەوەگونجاون، بەشێوەیەك کەشتێکی نوێ یان لێ دروست دەبێت جیاوازە لە سیفاتی دا لەگەڵ رەگەزەپێك هێنەرەکانی، بەمەش دەوترێت کەسیەتی کۆمەلگە.

وەلێرەدا دەپرسین ئەوبنەمایە چی یە کەکەسێتی کۆمەلگەی دەشتەکی لەسەر بنیاد تراوە؟بۆ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە*پێویستە بەراوردێك بکەین لەنێوان کەسێتی دەشتەکی وکەسیەتی شارستانیەتی دا، وەدەتوانین لەم بارەیەوە بڵێین کەکەسیەتی شارستانی لەسەر بەرهەمهێنان وەستاوە لەکاتێك دا کەسیەتی دەشتەکی لەسەر دەست بەسەراگرتن وەستاوە هەروەك دەزانین جیاوازی زۆرە لەنێوان رەوشتی بەرهەمهێنان ورەوشتی دەست بەسەراگرتن دا.*

ئێمە دەزانین بەشێوەیەکی گشتی کەتاکی شارستانی دێرین لەشارستانیەتە کەی دا(قورسە بژیان بژین بەپێی پیشەیان هەرجۆرێك لەبەرهەمهێنان بێت. وەلەوانەیەئەو بەرهەم هێنانەمادیی بێت یاخود فکری بێت.ئەوبەرهەمهێنانەبەهەرحاڵ کارامەیی یە کەبەدەست دێت لە رێگەی هەوڵ وراهاتن و ئەزموونەوە لەماوەیەکی زۆر بەی کاتەکاندا. وە هەتاوەك و کارامەیی تاکی شارستانی لەپیشەکەی دا باش بێت کەپسۆڕبووە تیایدا، بازاڕی

بـاش دەبێـت وئاسـتی بـژێوی بـەرز دەبێتـەوە بەبـەراورد کـردن لەگـەڵ ئەو کەسانەی کەلەگەڵی دا هاوبژێوو بوون.

بەڵام تاکی دەشتەکی ڕویەکی تری هەیە لەبیابان دەژیت، ولەبارەی بەرهەمهێنانەوە کەمێك نەبێت هیچی تر نازانێت. وە بیابان هیچی تێدانی یە جگە لەهەندێك گیا کەلێرەو لەوێ سەوز دەبێت ئەویش بەفرمانی خودا.قورئانی پیرۆزبە دانیشتوانی بیابان دەڵێت ﴿ وفي السماء رزقكم وماتوعدون﴾(الزاريات:22) لێرەدا ئاماژە بەوەدەکات بەو بارانەی کەلەئاسمانەوە دێتە خوارەوەکە دەبێتە هۆی سەوزبونی گیاوو وەبیرەکان پڕدەبنەوە. لێرەدا دەشتەکی تێر دەبێت وئاودێری دەکرێت بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە بەیانی و وداهاتوو. کێشەی گەورەی دەشتەکی ئەوەیە کەناتوانن سەرچاوەکانی گیاو ئاو(لەوەڕگا) لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن یاخود مافەکانیان لەسەر بەڵگەنامە(السند) تۆمار بکەن وەك چۆن شارستانیەتەکان سەروەت وسامانیان لەسەر( السند) تۆمار کردوە. سەرچاوەکانی لەوەڕگاو ئاو کەمن لەچاو ژمارەی گەشە کردویان. ئەوان ناچارن کەمەڵمڵانێ ودووبەرەکی بکەن بەهێزی شمشێر. وە لەدەشت دا شوێنێك نی یە بۆ لاواز کە داوای پرەنسیپەکانی دادپەروەری ویەکسانی بکات هەروەك شاعیری دەشتەکی کۆن دەڵێت:

*دەخۆینەوە ئاو ئەگەر بەڵێشاو بۆمان بێت*

*ئـــــەخۆنەوە ئەوانی دی قوڕوولیـــــتاو*

لەپەندەکانی دەشتەکی دا هاتووەکەحمق واتە(ڕاستی)بەشمشێرە!! وەبێ هێز گەواهی دەری دەوێت. هەروەها لە ووتەکانیاندا هاتووە کە(حەلاڵ بۆیە وازمان لەتۆ هێناوە بەناچاری وازمان لێهێناوی. ئەی حەلاڵ چارەسەر بەدەست ئێمە نی یە) ئەوەی لەگەڵ یان دانیشێت و گوێ لەوتەکانیان بگرێت بۆی دەردەکەوێت کەپیاوەتی لەلای ئەوان بەپێوەری زاڵبوون و دەست بەسەرا گرتنە کەسایشی پیاوێك دەکەن پێی دەڵێن (شێر) کەمافی خۆی بەبازووی بەدەست دەهێنێت. وەکەس چاری ناکات . لەشوورەی ترین کار بەیەکێك دەڵێن کە(الصانع)واتە(دروستکەر)بێت یاخود(الحائك)(چنین) بێت.ئەمەش لەروانگەی ئەوان دا واتای ئەوەیە کە (لاواز بژێوی ڕۆژانەی بەناڕەقی ناوچەوانی بەدەست دێنێت وەك ژنان) بەڵکو بەهێزی شمشێر بەدەستی نایەنێت! وەلێرەوە ناوی( کاری دەستیان) ناولێ نا(المهنة)یان پیشە، وە ئەم (المهنة)ش لە(الموهان)ەوە هاتووە واتە لە(سوکایەتی یەوە) وەرگیراوە.

## پێوەرەکانی شارستانی

کەسی شارستانی گوێ ناداتە ئەم بەها دەشتەکی یانە. چونکە ئەو هەر لە منداڵیەوە لەسەر بەهای جیاوازتر پەروەردەبووە. مرۆڤی شارستانی ڕێز لەخەڵك دەگرێت بەپێی کارامەیی یان لەپیشەکەیان وئەوەشی کەبەدەستی دەهێنن. شارستانی دەشتەکی بەکەسانی(تارانبارور چەتە) دادەنێت وبڕوای پێیان نی یە. هەروەها ئەوەی لەبیر دەچێت کەکەسی دەشتەکی بەچاوی(تورەی و بوغزاوی)سەیری شارستانی دەکات هەروەك چۆن شارستانیەتێك بەو شێوەیە سەیریان دەکات. دەشتەکیش بەهەمان شێوە سەیری شارستانی دەکات. بەبۆچونی دەشتەکی کەسی شارستانی ڕسوایەو بێ ڕێزەو مافی ژیانی نی یە.

دکتۆر **فاضل الجمالی** سەردانی هۆزی(عەنزەی) کرد لەبیابانی شام، وەکاتێك ئەم هۆزەی بینی سەری سوڕما کەبڕوا بەخودا دەکەن ونوێژو ڕۆژووی بۆ دەکەن لەکاتێك دا دەست ناپارێزن لەتالانی و داگیرکردنی(سەروەت وسامانی خەڵکی) هەرکاتێك کەهەلی گونجاویان بۆ

بڕەخسێت، پرسیاری ئەم دووفاقیەی لێکردون، لەوەلاّم دا ئەوەیان پێڕاگەیاندووە کەپێشتر بیریان لەم پرسیارە نەکردوەتەوە.

کێشەی دکتۆر **فاضل** ئەوەیە کە بەپێوەری شارستانی هەڵیان دەسەنگێنێ کە ئەوی تێدا پەروەردەبووە، بەلاّم دکتۆر **فاضل** ئەوەی لەبیر دەچێت کەئەوان پێوەری ڕەوشتی تایبەت بەخۆیان هەیە. (ئەوان خودا وەکو خۆیان دەبینن کەرێز لەپیاوی ئازا دەگرێت کە توانای تالاّن کردنی هەبێت) ئەوەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە چاکە دەکەن بۆ گیانی مردووانیان ئەویش بە ماڵی تالآن واتە بەو پارەیەی کەبەتالاّنی بەدەستیان هێناوە کەپێی دەڵێن(**غارة الضحی**) (واتە پەلاماردانی بەیانیان) ئەمە بەرێزترین ونزیکترینیانە لەخوداوە، چونکە بەرۆژی نیوەڕۆ دەکرێت کە ئەویش بەلگەیە لەسەر ئازایی‌و نەبەردی.

دەشتەکی تورە دەبێت کەپێی دەڵێیت(خودابێبەشت بکات لەپەلاماردانی بەیانیان) مامۆستا(عباس العزاوی) پرسیاری لەدەشتەکیەك کردوو پێی ووت: (ڕاستە کەچاکە دەکەن بۆ مردووەکانتان لەوەی کەبەدەستی دەهێنن(واتە لەپەلاماری بەیانیان)وە بۆ چی دەشتەکی تورە دەبێت کەپێی دەڵێیت(خودا بێبەشت بکات لە پەلاماری بەیانیان)؟

لە وەلاّم دا دەشتەکی وتی (ئایا لەپەلاماردانی بەیانیان حەلاڵ تر هەیە،ئەو پەلامارە بەرۆژی نیوەڕۆ دەکرێت،وەچۆن خودابێ بەشم بکات لەو جۆرە پەلامارادانانە؟!)

ناکرێت ئێمە سەرزەنشتی دەشتەکی بکەین لەسەر ئەو خورەوشتەیان.
خورەوشت لەڕاستی داهیچ نیە جگە لەوێنەیەک لەوێنەکانی خۆگونجاندنی
مرۆڤ لەگەڵ دەوروبەری دا. ئەگەر یەکێک لەئێمە هەر لەمنداڵیەوە لە
دەشتدا گەورە ببوایە ئەوی دەتوانی خورەوشتێکی دیکە بۆ خۆی دیاری
بکات، وە بیر مەندو پێشینەکان هەڵەیان کرد کاتێک کەپرەنسیپەکانی
ڕەوشت یان تەنهاله عەقڵەوە دەردەهێنا. دواتر ئەم پرەنسیپانەیان
دەسەپاند بەسەر خەڵکی دا(مرۆڤ لەنموونە بالاکان تێ ناگات کە
فەیلەسوفە ئیلهام وەرگرەکان باسیان لێوە کردوە. بەڵکو مرۆڤ لەسەر ئەو
شێوازە ڕەفتارەی دەڕوات کەکۆمەڵگەکەی ڕێزی لێ دەگرێت ئەگەر
کەسێک وەک شێوازەکانی کۆمەڵگەکەی ڕەفتاری کرد ڕێزی لێ دەگیرێت.
بەلام ئەگەر لەچوار چێوەی ئەو بەها کۆمەڵایەتیانە چووە دەرەوە وەک
مەیموون سەیر دەکرێت).

# هەڵەی هەندێك لەرۆژهەڵاتناسەكان

هەندێك لەرۆژهەڵاتناسەكان، ئەوانەی كەلە دەشتەكیان كۆڵیوەتەوە ، پێیان وایە پیاوی دەشتەكی ماڵی زۆر خۆش دەوێت، رێز لەهیچ شتێك ناگرێت تەنها دینارو درهەم نەبێت، لەدیدگای پیاوی دەشتەكی یەوە شتە مەعنەوییەكان هیچ بەهاو بایەخێك یان نی یە. وە لەو رۆژهەڵاتناسانەش (ئۆلیری) یە كەلەكتێبەكەی دا نوسیویەتی( Arabia before Mohamad) و دەڵێت (دەشتەكیەت) نمونەیەكە لەئارەزووی ماددی بەشێوەیەك كەچاوچنۆكی هەستەكانی داگیر كردووە هیچ دەرفەتێكی بۆ نەماوەتەوە لەخەیاڵ و سۆزو ئاین( ئەوشتەكان لەروانگەیەكی ماددی رەهاوە دەبینێ وە هیچ كارێك ئەنجام نادات ئەگەر قازانجێكی خێرای نەبێت)من پێم وایە كەئەم بیرو بۆ چونەی(ئۆلیری) بێكەم وكورتی نی یە. ئەو سەیری راستی یە كۆمەڵایەتیەكان دەكات تەنها لەلایەك وە لایەنەكانی دیكەش پشت گوێ دەخات. لەراستی دا لەوكاتەوەی كە دەشتەكی بە دوژمنكارێكی تاڵانچی دەبینین لەهەمان كاتدا بەكەسێكی بەرێزی بەوەفا دەیبینین تارادەیەك كەكەسی شارستانی ناتوانێت بگاتە

ناستی، لە ڕاستی دا دەشتەکی داواکارێکی ڕاستەقینەی سامانە بەلاّم داواکاری سامان نیە لەپێناوی سامان دا. سامان نیشانەی پیاوەتی وسەرکەوتنە. وەگوتنەداتە دەست فراوانی لە سامان دا هەرکاتێك بگاتە دەستی لێرەوە ستایشی دەشتەکی دەکرێت بە(تالاّنچی یەکی بەخشەر). ئەوتالاّنچی یە کاتێك تالاّن نیشانەیە بۆ هێز، وە بەخشەرە کاتێك بەخشین بەهەمان شێوە نیشانەیە بۆ هێز، لەبەر ئەوە کەسی دەشتەکی دەبینی لەنێو هەمو خەلکی دا سورە لەسەر تەنها فلسێك کاتێك کەلێی زەوت دەکرێت لەکاتێك دا(دەست کراوە ترین) کەسە کاتێك پەنای بۆ دەبەیت یان داوای یارمەتی لێدەکەیت وە هەموو ژیانی لەو پێناوە دا دەبەخشێ ئەمە سەرەرای سامانەکەشی(ئامادەیە سەروسامانی خۆی ببەخشێ لەپێنار کەسی بەرامبەر).

هەروەها دەشتەکی ڕاستگۆیەکی ڕاشکاوە(دووڕویی)و فێلّ وتەلّەکەی خۆش نارێت(الربا)کاری بەهەموو جۆرەکانی یەوە لاوازیەو لەگەلّ سروشتی کەسێکی ئازا و سەرکەوتوو ناگونجێت. کەسی دەشتەکی دەت کوژێت یاخود تالاّنت دەکات بەلاّم خیانەت لەسپاردەت ناکات. بەجۆرێك کەدەشتەکی لەرووی سپاردەوە متمانەی هەیە لەلای بەرامبەرەکەی. دەشتەکی لە دوورترین شوێنی دەشتەوە دێت بۆ جێ بەجێکردنی ئەو ئەرکەی کەلەسەر شانیەتی بەرامبەربەتۆ(لەکاتێك دا لەوانەیە تۆ ئەوت لەبیر چوبێتەوە یان لێی بێزار بووبیت بەدرێژای کات، وە بەدرۆ ور سوێند بەخودا ناخوات ئەگەر خواردنی ئەو سوێندەش ببێتە هۆی ڕزگار کردنی

لەتەنگ وچەڵەمەیەك، ئەگەر سوێندی بۆ خواردی بە(هوبل ، خودای پەرستراو، سولەیمانی کوڕی داود)ئەمە بەلگەیەکە لەلایەن کەسی دەشتەکیەوە.لەزۆر جاردا ڕاست گۆیەو ئەگەر سوێندی خوارد دڵسۆزە بۆی.

## کاتێك دەشتەکی شارستانی دەبێت

ئەمەیە کەسیەتی دەشتەکی بەوەی کەحەیەتی لە باشەو خراپە، کە هەموو بنیاد نراوە لەسەر سەرکەوتن ودەست بەسەراگرتن وئازایەتی. وەدەتوانم بڵێم کەئەم کەسایەتی یە (باشەو خراپەکانی) دەپارێزێت بۆئەوەی لەبیابان بمێنێتەوە. وەلێرەدا دەپرسین ئایا دەشتەکی دەتوانێت لەبیابانێکی وشك دا بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە؟ ئەو ئازایەیەکی نەبەردوو شمشێرێکی پەرێنەر هەڵدەگرێت، وە لەئاوەدانیەکانی دەوروبەری دا کەسانێکی شارستانی دەبینێ کەتێر بوون لەخواردن لەهەمانکات دا کەسانێکی ترسنۆکن. ئایا رێگەیان پێدەدات لەناو ئەو خۆش گوزەریانەدا بژین کەهیچ مافێك یان پێوە نی یە، یاخود داگیر یان دەکات وسامانیان بەتالان دەبات ؟ مێژوو زنجیرەکی دوورو درێژی لە پەلاماردانی دەشتەکی بینیوە بۆ سەر ئاوەدانیەکانی دەورو بەری بیابان. ئێمە کارمان نی یە بەم پەلاماردانەوە لە رووی سیاسیەوە لێکۆلەری تایبەت بەخۆی هەیە، بەڵکو ئێمە دەمانەوێت لەلەلایەنە کۆمەڵایەتی یەکەوە لێکۆلینەوە بکەین.

ئەوەی پەیوەندی بەبابەتی ڕەوشتەوە هەیە کە ئێمە لەو بارەیەوە قسە دەکەین. (ابن خلدون) دەڵێت( کە دەشتەکیەکان دەست دەگرن بەسەر ئاوەدانی یە شارستانی یەکانداو بەخۆشیەکانی ڕادێن و بەرەبەرە ڕەوشتە کۆنەکانیان بیر دەچێتەوەو ڕەوشتی شارستانی وەردەگرن. (ابن خەلدون) مەبەستی ئەوەیە کە دەشتەکیەکان هەموو ڕەوشتەکانی لەبیر دەچێتەوە بە باشەو خراپەوە.

وەمن خەریکە پێم وابێت ئەم بۆ چونەی(ابن خەلدون) ڕاست بێت لەچوارچێوەی ئەو سەردەمەکۆنانەی کە ابن خەلدونی تێدا ژیاوە یاخود مێژووی خوێندونەتەوە.بەلاّم ئەم بۆ چونەی (ابن خەلدون) بۆ کۆتای سەردەمەکۆنەکان(واتە مەبەست لەکۆتایەکانی سەدەی پانزەیەمە کە ابن خەلدون لەوماوەیەدا ژیاوە) زۆر ڕاست نیە، لەگەڵ ئەوەش دا خالّی نیە لەڕاستی یەوە. بەبۆچونی من کۆتایەکانی سەردەمەکۆنەکان جیاوازە لەسەر دەمەکانی پێشوو لە جۆری چەك کەلە شەڕەکان دا بەکار دەهات لە نێوان دەشتەکی وشارستانیەکان.خەلکی شمشێری بەکارهێناوە هەروەك چۆن ئاشکرایە، لەبەر ئەوەی لەزۆر بەی کات دا دەشتەکی سەرکەوتوو بووە بەسەر ئاوەدانی یە شارستانیەکاندا. دەشتەکی کارامەترە لەجەنگی شمشێردا لە کەسە شارستانیەکان.بەواتای ئەوەی ئەوان دەست دەگرن بەسەر ئاوەدانی یەکاندا ودەسەلاّتی تێ دا دادەمەزرێنن وچینی دەسەلاّتدار پێك دەهێنن.بەلاّم لەدوا سەردەمەکاندا بە کارهێنانی شمشێر بەسەر چوو چەکی ئاگرین جێگەی شمشێری گرتەوە. دەشتەکی ناتوانێت

ئەم چەکە بەرھەم بهێنێت یاخود هونەر بەکار بهێنن لەدروست کردنی دا هەروەکو چۆن شارستانیەتەکان هونەریان بەکار هێنا لەدروست کردنی دا، لەبەر ئەوەی دەشتەکیەکان هەستیان بەتواناى کرد لەداگیرکردنی ناوەدانی یەکانی دەورو بەریان هەروەك چۆن لەکۆن دا دەیان کرد.

دەشتەکیەکان هەرکە لەشارستانیەتەکان نزیك دەبوونەوە(تۆپ)ی گەورەیان رووتێ کرابوو، وە ئاگر باران دەکران وە گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئازایەتی یە کۆنەکەیان هیچ سودێکی نابێت لە بەرامبەر لولەی تۆپ و گوللەی ئاگرین.

لەلێکۆڵینەوەم لەمێژووی عێراق لە سەردەمی عوسمانی دا تێبینی ئەوەم کرد کە هۆزە دەشتەکیەکان دەهاتن بۆ عێراق لەرێگەی هاتنێکی(قۆناغ بەقۆناغەوە)واتە بەشێوەی (التدریجی) نەك لەرێگەی رزگارکردنێکی جەنگی یەوە. وە هەندێك لەهۆزەکان هەوڵیان دا لەرێگەی کاریگەری مەزهەبی (وەهاب )یەوە عێراق داگیر بکەن یان چەند جارێك لەرێگەی شمشێرەوە، بەلام شکستی هێنا. وە حکومەتی عوسمانی توانی بەرپەرچ یان بداتەوە دوای ئەو قسابخانەیەی کەپێی هەستان لە (کەربەلا) لە کۆتایەکانی سەدەی هەژدەیەم. محمد عەلی توانی هێرش یان بکاتە سەر لەپایتەختەکەیان لەناوجەرگەی بیابان وەگورزێکی توند لەجولانەوەکەیان بدات، وە ئەم جەنگە رێنەی نەبوو لەمێژووی دورگەی عەرەبی دا کەهیچ سوپایەکی شارستانی نەی توانی وە بچێتە ناو جەرگەی بیابان وڕزگاری بکات.کورتەی ئەوەی دەمەوێت بیلێم لەم بارەیەوە ململانێی نێوان

دەشتەکی و شارستانیەتە لەسەر دەمەکانی کۆن دا شێوازێکی نوێی وەرگرتووە بەشێوەیەك کەحۆزەکانی دەشتەکی دزەیان دەکردەناو ئاوەدانی یەکانی دەوروبەروو تێی دانیشتەجێ دەبوون بەبێ ئەوەی هەوڵی دەست بەسەراگرتنی بدەن.

## ڕەوشتی هۆزەکانی عێراق

ئەمەوێت بچمە سەر لێکۆڵینەوەی ڕەوشتی هۆزەکان دوای شارستانی بوونیان. ئەوەی جێگەی ئاماژەیە کەزۆر بەی لێکۆڵینەوەکەم لەبارەی هۆزەکانی عێراق چڕبووەتەوە. مانای ئەمەش ئەوە دەبێت کەلێکۆڵینەوەکەم لاوەکی دەبێت نەك گشت گیر بێت بەلام بەهەرحاڵ هیوادارم لێکۆڵینەوەکەم سوودی هەبێت بۆ برا لێکۆڵەرەکان لە وولاتانی دیکەی عەرەبی، کەدەتوانن بەراوردێك بکەن لەنێوان بارودۆخی عێراق لەلایەن ڕەوشتی یەوە بەبارودۆخی ولاّتانی دیکە تاوەکو ڕوبەکی لێك چوو یاخوود جیاواز لەنێوانیاندا بدۆزرێتەوە. وە ئەوکارەی کەدەمەوێت سەرنجتانی بۆ ڕاکێشم ئەوەیە کەئەو هۆزە دەشتەکیانەی کەلەعێراق دا نیشتەجێ بون لە دواسەردەمەکاندا، بەتایبەتی لەسەردەمی عوسمانی دەشتەکیەکان بەشێکی زۆر لە کردارەباشە کۆنەکانیان لەدەست دا لە کاتێك دا کردارە خراپەکانیان پاراست.( ڕاستگۆی و ڕاشکاوی و پاراستنی سپاردەکانیان لەدەست دا بەلاّم پەیوەست بوون بەدەمارگیری

هۆزایەتی وتۆڵەسەندنەوەو دەست درێژی کردنە سەر یەکتری وشانازی کردن بەتالانی وداگیر کردن)

*ئەمەش کارێکی نامۆیەو سەرنج ڕادەکێشێ، ئەوەهۆکارانە چین کە باشەکانی دەشتەکی لاواز دەبن لە بەرامبەر باروودۆخی شارستانی نوێ لەکاتێك دا خراپەکان خۆیان ڕادەگرن لەبەرامبەر ئەو باروودۆخەی شارستانیەتەدا، دەبێت هۆکاری کۆمەڵایەتی هەبێت لەپێش ئەوسەردەمەوە کەدەبێتە هۆی ئەم دەرەنجامە کە خاڵی نییە لەوون بونی ڕەوشت. ئایا ئەو ون بونە چی یە؟)* ئەوەی کەدەمەوێت بیڵێم هاوڕێیان لەلێکۆڵەرە عێراقی یەکان ئەوەیە کە ئەوکاتەی ڕژێم و دەستەلات باو بور لە عێراق لەم سەردەمەی دواییدا دەستی هەیە لەم وون بونەی ڕەوشت دا.

وەپێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێت کە حکومەتی عوسمانی حکومەت نەبوو بەمانا ڕاستەقینەکەی...گوێی نەدەدا بە پاراستنی ئاسایش و ڕێکخستن وەك حکومەتە پێشکەوتووەکان، گرنگی نەدەدا بەویستی خەڵکی جگە لە وەرگرتنی باج و سەرانە ئیتر دواتر خەڵکی چییان دەکرد، کێشەیەك نەبوو بۆ دەستەلات.

سیاسەتی حکومەت لەبەرامبەر هۆزەکان ئەوە بوو کە وازی لە هۆزەکان دەهێنا بۆ ئەوەی شەڕ بکەن و تالانی یەکتری بکەن. ئاشکرا بوو کەهانی دەدان بۆ شەڕکردن و تالان کردنی لەپێناو لاوازکردن یاخود لەسەر بنەمای(جیاوازی کەسوودی دەبێت). ئەوەی زیاتر ناکۆکی ئەم هۆزانەی زیاتر کرد، زەویەکانی عێراق بەردەوام لەگۆڕاندابوون لەباشی

بەرهەمهێنان و ئاسانی ئاودێری کردنی، زۆر جار پارچەیەك زەوی لەسەرەتادا باش دەبوو بەڵام دواتر بەهۆی کەڵەکەبوونی (خوێ) وە خراپ دەبوو.

هۆزەکان ناچار دەبوون لەزەویەکەوە بگوازرێنەوە بۆ زەویەکی دیکە، ئەم گواستنەوەیەش لە دوای جەنگێکی خوێناویەوە دەکرا بەشێوەیەك هۆزی بەهێز دەستی دەگرت بەسەر زەوی باش دا دوای ئەوەی خاوەنەکانیان دەردەکردن.

عێراق رژێمێکی جێگیری نەبوو بۆ تۆمارکردنی زەوی وزار، لەبەر ئەوەی هۆزەکان دەجەنگان لەسەر زەوی وزارە باشەکان هەروەك چۆن پێشینەکانیان لەبیابانەکاندا لەسەر ئاو ولەوەڕگاکان دەجەنگان. ئەوەی لێکۆڵینەوە دەکات لەمێژووی هەر هۆزێکی عێراقی ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کەهیچ هۆزێك لەسەر زەویەکی دیاری کراو جێگیر نەبووە. یان ئەوەتا ئەو هۆزە دەرکراوە لەسەر زەوی وزارەکانی یان هۆزی تری دەرکردووە بەپێی هێزوتوانای دەست بەسەراگرتنیان، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەرۆڵەکانی هۆز پارێزگاری بکەن لە داب و نەریتە کۆنەکانیان کەیارمەتیان دەدات بۆ مانەوە لەو چوارچێوە گرژەدا.

لەو کاتەی کەهۆزەکانی عێراق دەجەنگان و یەکتریان تالان دەکرد و هەستیان بەگەورەییەکی زۆر دەکرد لە بەرامبەر هەرلایەنێك کە دەستدرێژییان بکاتە سەر، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا لەبەرامبەر زوڵم و ستەمی حکومەت هەڵوێستی بێدەنگی و ملکەچیان دەنواند. وە دەتوانم

بلێم کە تاکی هۆز دوو ڕووی هەبووە. ڕوویەکیان هەستی بەگەورەیی و بەرزیی دەکرد کاتێك دەگەیشتە هاوپێگەکانی خۆی لەرۆڵەی هۆزەکانی تر کەلێرەدا دەبینی لەهەموو کەس زیاتر تورەو دەمارگیرەو هەوڵی تۆڵە سەندنەوە دەدات، بەلآم لەبەرامبەر حکومەت و پیاوانی دا کەسیەتیەکی تری هەیەو ملکەچەو خۆڕاگرە بەرامبەر سوکایەتیەکانی حکومەت بەبێ ئەوەی ڕاپەڕێت.

تاکی هۆز لەبیاباندا بەرە بەرە(تایبەتمەندی) ڕاشکاوی و دەست پاکی و لێبوردەی وون دەکرد کەلە باوباپیرانیەوە بۆی بەجێ مابوو، ئەوکاتەی بینی پیاوانی حکومەت وەستاون وتاژەڵەکان وبەروبوومەکشتوکاڵیەکانی بۆ دەژماردن، بۆ یەناچاربوو درۆ بکات وسوێند بەخوداوو هەموو پێغەمبەرانی بخوات بۆ ئەوەی هیچ نەبێت کەمێك لەباجەکانی لەسەر کەم بکەنەوە، ئەگەر لەگەڵ حکومەت شوێنی ڕاستی بکەوتایە هیچی بۆ نەدەمایەوە لە خواردن وپۆشاك بۆ ئەوەی بەشی خۆی ومنداڵەکانی بکات. لەوتەگێراوەکانی پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) ڕۆژێك پێغەمبەر بەلای ماڵی ئەنصارەکان تێدە پەڕێت(گاسن)ێك دەبینێت و دەفەرمێت (ئەمە ناچێتە ماڵی هیچ کەسێکەوە ئەگەر لە گەڵیدا سەر شۆری نەبردبێتە ماڵەوە) وەلێکۆڵەرەوان هەوڵ یان داوە ئەم فەرمودەیە شی بکەنەوە بەوتەی (ابن خەلدون) ئەو کەسانەی کشتوکاڵ دەکەنەپیشە دەکەونە ژێر باری ستەمی دەستەلآت داران وسەپاندنی باج وسەرانە بەسەریان دا وە ئەمەش دەبێتە هۆی سەرشۆڕیە ئەوەش کەبەشوێنی دادێت لە ڕەوشت (فێڵ وتەڵەکە)یە.

پێموایە ئەم فەرموودەیە تارادەیەکی زۆر بەسەرهۆزەکانی عێراق جێبەجێ دەبێت، چونکە ئەوان کەوتبونە ژێر باری حکومەتی عوسمانی بۆ ماوەیەکی درێژ، لەئەنجامی ئەمەدا فێری درۆو تەڵەکە بوو بوون وە بووبوونە خاوەنی دووکەسایەتی جیاواز، کەسایەتیەکیان بەرەنگاری پیاوانی حکومەت دەبوونەوەوکەسایەتیەکی دیکەیان بەرەنگاری هاوشێوەکانی خۆیان دەبوونەوە لەرۆڵەی هۆزەکانی دیکە.

ئەتوانم بڵێم کە هۆزەکانی عێراق هیچ لەرەوشتیان نە گۆڕا، دوای دروست بوونی نیشتمانی عێراق، وە ئەوەی جێگەی داخە کەحکومەتی نیشتمانی نوێ لەسەر داروپەردوی حکومەتی لەناوچوو دروست بوو، وە هەمان فەرمان بەرە کۆنەکان بەکارهاتنەوە بەشێوە یەکی فراوان بە شێوەیەك کەتاکی هۆز هیچ جیاوازیەکی نەدەبینی لەنێوان ڕابردوو ئێستادا.

ئـەوەی زیـاتر بـارو دۆخەکـەی خـراپتر کـرد حکومــەتی نیشــتمانی سیســتەمی بـەزۆر(ســەرباز)گرتنــی ســەپاند بەســەر ڕۆڵـەی هۆزەکـان دا. دواقۆنـاغی ئەوانــە لەســەردەمی عوسمــانی دا لێــی بەخشــرا بــوون، وەکاتێــك تــاکی هــۆز بینــی کەئەفســەران وســەربازان بــۆ گرتنــی ڕۆڵـەکانیان دێـن، ئەمــە ســەرەڕای پیــاوانی بــاج، بۆیــە هەمیشــە خۆیـان لەفەرمانبــەرانی حکومـــەت دەدزیـــەوە. هۆزەکـــانی ئـــەمڕۆ(دیـــارە مەبەســـت لەئـــەمڕۆ ئەوکاتـــە دەگرێتـــەوە کـــە عـــەلی وەردی ئـــەم لێکۆڵینـەوەیـــەی تیانوســـیوە) لـــە هـــەموو پیاوێـــك دەترســـن کـــە

پەیوەنــدی بەحکومەتــەوە هــەبێت جائــەو پەیوەندیــە چ دوور بێــت یــاخود نزیــك چــونکە ئــەو پیاوانــەی حکومــەت تــەنها کــاری خراپــەیان لێدەوەشایەوە.

لەبەر ئەوەی نەیاندەتوانی ڕاشکاو یاخود ڕاستگۆبن لەگەڵیاندا ئەگەر ئەو ڕاستگۆییــەش سودی هەبوایە بۆ یان.

جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك لە خوێندکاران چووین بۆ گوندێك بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە بکەین لەسەر بارودۆخی کۆمەلایەتیان. بەلآم خەلکی گوندەکە وایانزانی ئێمە سیخوڕین و لەلایەن حکومەتەوە نێردراوین بۆ گەران بەشوێن هەواڵ یان شتێکی دیکەدا یان کێشەیان بۆ دروست بکەین. بەوەلآمەکانیانەوە تکۆڵی کردن دیار بوو وە بڕوایان پێنەدەکردین ئەگەر سوێندمان بەخوداوو بەقورئان بخوار دایە. لە ڕوانگەی ئەوانەوە سودی نەبوو چونکە ئەوان ڕاهاتبون بە خواردنی سوێندی درۆ بەخوداوو بەپێغەمبەرەکانی لەکاتی پێویست دا. نەمەتەنها جوتیارانی نەدەگرتەوە بەلکو لەنێوان دانیشتوانی شارەکانیش دا باووبوو بەتایبەتی چینی نەخوێندەوارەکانیان لەبەر ئەوە هەر سەرژمێریەك کە حکومەت یان هەر لیژنەیەك لەپسپۆڕان پێی هەلدەستان هەڵە بوو وەنە دەکرا پشتی پێ ببەسترێت.

وە لەو جیاوازیانەی کەخەلکی باسیان لێوە دەکرد لەو بارەیەوە دانیشتوانی عێراق ژمارەیان دەگەیشتە 10 ملیۆن کەس کاتێك کە شەکر یان قوماشیان دابەش دەکرد بەپسوڵە. بەلآم ئەم ژمارەیە کەم دەبوویەوە

بۆ 3ملیۆن کەس کاتێك ناو تۆمار دەکرا بۆ سەربازگرتنی زۆرەملێ مانای ئەمەش ئەوەیە کە خەڵکی جارێك بە زیادەوە درۆ دەکەن وجارێکیش بەکەمی درۆ دەکەن بەڵام ژمارەی ڕاستی دانیشتوان تەنها خودا خۆی دەی زانی!!

## كاریگەری دەرەبەگایەتی لەسەر ڕەوشت

درای ئەوەی باسی کاریگەری حکومەتمان کرد لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ڕەوشت لەلای هۆزەکانی عێراق.ئێستا دەچینە سەر کاریگەری دەرەبەگایەتی لەسەر ڕەوشتی هۆزەکان. ئەوەی لێرەدا شایانی باسە کەدەرەبەگایەتی لەعێراق دا بلاَو دەبوویەوەو کاریگەری هەبووبۆسەر هەڵوەشاندنەوەی ڕەوشت، ئەم کاریگەریەش بەقەدکاریگەری حکومەت لەسەر ڕوشت توندترو هەڵ وەشێنترە وە ئەگەر ئەم کاریگەریە زیاتر نەبێت ئەوا کەمتر نیە .

وەدەتوانم بڵێم کە دەرەبەگایەتی لەعێراقدا تازە دامەزراوە. دەرەبەگایەتی لەسەر دەمی عوسمانی بەم شێوەیەی ئێستا نەبوو، وەنهێنی ئەمە ئەوەبوو کەحکومەت هەستا بە تۆمارکردنی زەوی وزارەکان وە تۆمارکردنی خاوەنداریەتی ئەم زەوی وزارانە نکۆڵی لەوەناکرێت، حکومەت ویستی بەم تۆمارکردنە بارو دۆخەکە باش بکات بەلاَم لەهەندێك لایەنی تردا بارو دۆخەکە خراپ بەسەرحکومەت دادەشکایەوە.

لە ڕابردوودا گەورەی هۆز ڕابەری هۆزەکەی بوو وە لەکاتی شەڕدا سەر پەرەشتی کاریان بوو وەك چۆن لەکاتی ئاشتی دا سەر پەرەشتی دەکردن، هەروەك چۆن زانایانی کۆمەڵناسی دەڵێن(خەڵك خۆیان شوێنی گەورەی هۆزەکەیان کەوتبوون نەك گەورەی هۆز بەزۆر دەستی بەسەر دا گرتبێ) وە ئەم پلەوو پایە گەورەی هۆز بەهۆی گوێ ڕایەڵی وڕێزی هۆزەکەیەوە بەدەستی هێنا بوو. ئەگەر ستەمی لەهۆزەکەی بکردایە یان فریوی بدانایە لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا ئەوا لێی دوور دەکەوتنەوە وە ئەوکات دەکەوتنە شوێن یەکێك لەرکابەرەکانی ناوهۆزەکەیان ئەویش ڕکابەرەکانی لەلایەن براکانی یان ڕۆڵەی مامەکانی پێك دەهاتن، بۆیە گەورەی هۆز ناچار دەبوو بەباشی مامەڵە بکات بۆ پاراستنی ڕابەرایەتی هۆزەکەی.

گەورەی هۆز هیچ مافێکی نەبوو لەبەرهەمی زەوی جگە لەوەی کەدەی توانی بیکات لە ئەرکەکانی ڕابەرایەتی کردن کە ئەویش ڕێك کەوتبوو لەسەری، وە ڕاستە ئەگەر بڵێین ڕۆڵەکانی هۆز هەڵدەستان بەبەرهەمهێنانی زەوی لەسەر بنەمای هاوکاری لەژێر ڕابەرایەتی سەرۆکی هۆز، وە ڕۆڵەکانی هۆز هەستیان دەکرد کە هاوبەشن لەزەویەکان نەك بەکرێگیراوێك بن بۆ ئەمەش(کۆك) لەکتێبەکەیدا(بەربەستەکان و وەلام دانەوەکان لەرۆژهەلاتی نێوەڕاست) دەڵێت سەرۆکی هۆزەکان لەسەردەمی ڕابردوودا هەڵدەستان بەفەرمانی سەرپەرشت کاری لەسەر زەویە کشتوکاڵیەکان بەشێوازی هاوکاری وکەوتنە ژێر باری هۆزەوە بوو.

بەلام ئێستا دوای پێوان وتۆمارکردنی زەویەکان بەناوی سەرۆك هۆزەکانەوە باروودۆخەکە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە سەرۆك هۆزەکان هەست دەکەن کەئەو زەویانە موڵکی تایبەتی خۆیانە، سەرۆك هۆز دەتوانێت بۆ خۆی وە بەری بهێنێت تاحکومەت لەگەڵی دا کۆك بێت، لێرەوە زەویەکانی دەدایە دەست جێنشینەکانی وە خۆشی لەپایتەخت نیشتەجێ دەبوو خۆی دەگونجاند لەگەڵ فەرمان ڕەواکانی . ئێواران دەچوو بۆ شوێنی ڕابواردن وکات بەسەر بردن وە ئەوەی کەجوتیاران لەساڵێك دا کۆیان دەکردەوە ئەو بەسەر گۆرانی بێژو سەماکەرەکاندا خەرجی دەکرد بە واتایەکی تر سەرۆکی هۆز لەجێگەی گەورەی دەرەبەگەکان بوو کە دوور بوو لەزەوی وزارەکانی. دووریەکی زۆر کەوتبویە نێوان ئەور شوێن کەوتوانی. وازی لە ئەرکەکۆمەلایەتی یە کۆنەکەی هێنا بوو بۆ هۆزی خۆی، وە بێزار بوو بەسەردان کردن وبینینی خەلکی دێهاتەکەی بە خۆش گوزەرانی شارەکان ڕاهاتبوو وە ئاسان نەبوو بۆی جارێکی دیکە لەدێهات بژیت وەك چۆن باوکی خوالێخۆش بووی پێی ڕاهاتبوو.

هەندێك لە سەرۆك خێلەکان پیاویان هەبوو کەسەرانەیان بەسەر خەلکی دا دەسەپاند بەشێوە یەك کە دێهاتی عێراقی ئەو شێوازەی بەخۆیەوە بینی بوو وە ئەوپیاوانەی کەشوێن کەوتەی سەرۆك خێلن، بەناوی جۆراوجۆر دەناسرێن بەپێی ئەوشوێنەی تێی دا دەژین. بۆ نمونە لەناوچەی عەمارە بە(الحوشیە) واتە بە(کە سە پیرۆزەکان)ناسرابون وە لەفوراتی ناوەڕاست بە(الصبیان) (هەرزەکار) ناسرا بوون وە لە(موتفق) یش بە(

غوسمان) واتە هاودەم ناسرا بون. بەم شێوەیە جوتیاران بەدەست یانەوە دەیان نالاًند چەوساندنەوەی ئەمانە زیاتر بوو لە چەوساندنەوەکانی پیاوانی حکومەت چونکە پیاوانی خێلٚ بەئاسانی دەیان توانی لەسەر ئازاردانیان وگرتن یان و کوشتن یان ئەگەر ئەرکەکانیان بەرامبەر پیاوانی خێلٚ جێبەجیٚ نەکردایە، هیچ یاسایەك نەبوو بۆ ئەم جۆرەکەسانە که رەفتاروو هەلٚس وکەوتەکانیان سنور داربکات جگە لەتوانای سەرۆك خێلٚ نەبێت. وە ئەگەر سەرۆك خێلٚ سامانی لەناو(شوێنی رابواردن وکات بەسەربردن)دا بەفیڕۆ بدایە ئەوا جوتیارانیش دەکەوتنە ژێر کاریگەری ئەم عشقە پیسەوە.

هیچ پێویست بەوەناکات کەبلێین ئەم باروو دۆخە دەبێتە هۆی هەلٚوەشاندنەوەی رەوشتی جوتیارانی عێراق.جونکە جوتیار ناچار بور لەبەرامبەر پیاوانی خێلٚ بە هەژاری وبەپاکی خۆیان پیشان بدەن، بەلاٙم لەناخیانداشتێکی دیکە هەبوو. چونکە بەشێك لەبەرهەمی دزی بوو پێش ئەوەی پیاوانی خێلٚ بێن بۆی، کاتێك ئەوان دەهاتن دەستی دەکرد بەسوێند خواردن بە خوداوو بەهەموو پیرۆزیەکانی تر، کەئەدزی کردووە و نەهەرگیزیش دزی دەکات.

زۆر دەگمەنە کەجوتیارێکی عێراقی بدۆزینەوە کە دز نەبێت، وە زۆر دەگمەنە کە جوتیارێك بدۆزینەوە سوێند نەخوات بەباوەری بۆ(نیشاندانی) دەست پاکی خۆی لە دزی.

ئێمە ئەمە ناو دەنێین دزی!! بەلاّم جوتیار ناوی دەنێت(مافێکی ڕەوا) بۆ ئەم کارەش گلەیی لەسەر نی یە و لۆمەی ناکرێت، چونکە جوتیار دەیەوێت بژیت بۆیە ئەم دزیە دەکات، ئەگەر پەنا نەباتە بەردزی ئەوا خۆی و منداڵەکانی لەبرسان دا دەمرن.

لەوسەرگوزەشتەخۆشانە کەلەم بوارەدا دەگێڕدرێنەوە دەڵێن کە(سەید)ێك هەبووە(واتە نەوەی پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) پارچە زەویەکی هەبووە و کۆمەڵێك جوتیار کاریان تێی دا کردووە. ئەم جوتیارانە دەست یان کرد بوو بەناپاکی و ودزی کردن لیی، سەیدەکە بەم فێڵ وتەڵەکەیەی جوتیارەکانی زانی و پاڕایەوە لەخودا کەتۆڵەی ئەم فێڵ وتەڵەکەیەیان لێبکاتەوە وە خوداش بەخێرای وەلاّمی نزاکەی دایەوە وە وا ڕێك کەوت کە بۆ ڕۆژی دواتر گەورەی جوتیارەکان بمرێت، هەموو جوتیارەکان لەزەوی ئەو سەیدە هەڵهاتن وە ئەم هەواڵە لەنێوو هۆزەکاندا بڵاو بوویەوەو وەکەس نەی دەوێرا لەسەر زەویەکەی کاری لەگەڵ دا بکات، وە ئەم سەیدە لەکۆتایدا ناچاربوو واز لەزەویەکەی بهێنێت و کارێکی دیکە بگرێتە ئەستۆ بۆ بەڕێوە بردنی گوزەرانی ژیانی. سەیدەکە زانی کە دەتوانێت(قدیس)ێك بێت لەنێوان ڕزڵەی هۆزەکاندا بەلاّم ناتوانێت خاوەنی پارچە زەویەك بێت کە جوتیاران کاری تێدا بکەن، چونکە جوتیاران ناتوانن کشتوکاڵ بکەن لە پارچە زەویەك دا بەبێ ئەوەی دزی نەکەن لەبەر هەمەکەی.

لێرە دا دەبێت ئەوە وەبیر بهێنینەوە کە سروشتی دزی لای جوتیارانی عێراقی جیاوازە لەوەی کە باربابیرانی دەشتەکی لەبیابان لەسەری ڕاهاتبوون، دەشتەکی دزی دەکات بە تیژی شمشێرەکەی دەشتەکی دزیەکی خۆشنارێت لەڕێگەی فێڵ وتەڵەکەبازیەوە،چونکە لەڕوانگەی ئەوەوە کاری لاوازو ترسنۆکەکانە. بەڵام شمشێر بۆ جوتیار هیچ سودێکی نی یە کەواتە دەبێت ڕێگەیەکی درۆزنانە بگرێتە بەر بۆ دزی ئەگەر ویستی بژی.

## كاریگەری سوخۆرەكان لەسەر ڕەوشت

دوای دەرەبەگ(فیودالّ) سوخۆرەكان دێن كەبەشێوەیەكی فراوان بلاّو بونەتەوە لەنێو هۆزەكانی عێراق دا، هەر شوێنێك بگەڕێین لەبازاڕەكانی دێهاتی عێراقی دا خاوەنی(فرۆشگا) دەدۆزینەوە كەپشت بە سویەكی ئاشكرا دەبەستن لەئالّ وگۆڕكردنەكاندا لەگەلّ جوتیاران.

جوتیاری عێراقی هەر لەباوباپیری دەشتەكی یەوە بۆی ماوەتەو كەبیر لەئەمڕۆ بكاتەوەو گوێ نەداتە بەیانی. چونكە ئەو تا ئێستاش وادادەنێت كە گرنگی دان بە كاروباری پاشەڕۆژ بەلّگەیە لەسەر لاوازی مرۆڤ وكەمی متمانەی بە ئازایەتی وبەهێزی شمشێری بۆ یە دروشمی بووە بە(ئەوەی لەگیرفانتدا یە خەرجی بكە، بۆت دێت لەشوێنێكی دیكەوە لەلایەنی خوداوە) بۆیە دەبینین جوتیارەكان دەچن بۆلای خاوەنی فرۆشگا ئەوەی كەپێویستیەتی بەقەرز لێی وەردەگرێت.ئەوانیش ئەم هەلە دەقۆزنەوەو بە ئارەزوی خۆیان نرخیان بەسەر دا دەسەپێنن، ئەو ڕۆژە هاتەپێشەوە كەبڕیارە جوتیار قەرزەكانی بداتەوە بە خاوەن قەرز. جوتیار هەست دەكات كەناتوانێت قەرزەكەی بداتەوە دوبارە قەرزەكەی بۆ تۆمار

دەکرێتەوە دوای زیاد کردنی (سو) لەسەری. جار لەدوای جار ئەم بڕە کەڵەکە دەبێت تا لە کۆتای دا دەبێتە دوو ئەوەندەی جاری یەکەم، یەکێك دەگێڕێتەوە کە جوتیارێك لە فوراتی ناوەڕاست بڕێك پارەی کەم لەیەکێك لە سوخۆرەکانی ئەو ناوچەیە قەرز دەکات بۆ کڕینی سێ مریشك بۆ ئەوەی سەریان ببڕێت بۆ یەکێك لەمیوانەکانی وە ئەم بڕە قەرزە جار لەدوای جار کەڵەکە دەبوو تا لەکۆتای دا جوتیارەکە ناچار بوو گایەك بفرۆشێت بۆ دانەوەی نرخی ئەو سێ مریشکە.

نمونەی ئەم چیرۆکانە ئەوەندە ڕوو دەدەن لەدێهاتەکانی عێراق دا کەلە ژماردن نایەن. وە هەموو ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی تاچەند جوتیاری عێراقی کەوتوەتە ژێر بارێکی قورسەوە لەلایەن خاوەن قەرز و سوخۆرەکانەوە. وە دەتوانین بڵێین کە ئەمە دەبێتە هۆی دروست بوونی (گرێیەکی دەرونی) لە جوتیار دا بەرامبەر هەر بەڵێنێك کەپێی دەدرێت یاخود هەر قەرزێك کەدەی کات لەبەر ئەوە جوتیار ناچارە واز لەڕەوشتی(دڵسۆزی) بهێنێت کە باوباپیری دەشتەکی پێی ناسراوە، خەلکی دێهاتەکانی عێراق بەوە ناسراون کە قەرز کوێرن بەپێچەوانەی دەشتەکی بیابان( کەلەکاتی خۆیدا قەرز دەدەنەوە بە خاوەن قەرزەکانیان).

وە زۆر جار دەبینین جوتیاران بەڵێن نابەنە سەر، هەرکاتێك بۆ یان بلوێت نکۆڵی لەقەرزەکانیان دەکەن. ئەوەی یارمەتی دەرە بۆ بلاو بوونەوەی ئەم گرێ دەرونی یە لەنێو جوتیاران دا ئەوەیە کە بەچاوی ڕق وکینەوە سەیری هەر فرۆشیارێك دەکەن هەروەك بەپیاوێکی دادەنێن نە

ڕێزو نە پیاوەتی تێدایە، لەبەر ئەوە هیچ قورس نی یە بەلایانەوە ئەگەر بەڵێنەکان نەبەنە سەر لەگەڵ فرۆشیارەکاندا.

فرۆشیارەکانیش بەشێوەیەکی توندتر و زیاتر لەوان وەڵام یان دەدەنەوە وە هیچ دوو دڵنابن لە شکات کردن و دادگاییکردنیان و دەیانخەنە ژێر شمشێری یاساوە. ئەم جەنگە لەنێوانیان دا(دەبێتە ململانێیەکی دووررو درێژ). جوتیاران دەسی دەسیان پێدەکەن و لێیان هەڵدێن. فرۆشیارەکان بەشوێنیانەوەن و بەڵگەی دەست بەسەراگرتنیان بەدەستەوەیە یاخود پیاوانی دەوڵەت دەنێرنت بەشوێن یاندا. لەو پەندە باوانەی کەلەدێهاتەکانی عێراق دا باوە کە دەڵێت(قەرز ڕزقە) وەمەبەستیش لەم وتەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەبەئاسانی قەرز وەردەگرن و بە ناڕەحەتی دەیدەنەوە، قەرز ڕزقێکە خودا بۆی ناردوون وە بووەتە موڵکیان وهەروا ئاسان نی یە بیگەڕێننەوە ئەمە لەکاتێك دا هەست بەبێزاری وناڕەحەتی دەکەن ئەگەر یەکێك قەرزیان بخوات.

هاوڕێیەکم پێی ووتم ڕۆژێك یان لەیەکێك لە کۆڕەکانی دێهات دا گوێم لە ئامادەبووان گرتبوو باسیان لەیەکێك لەپیاوەکان دەکرد و ستایش یان دەکرد پێیان دەوت(شێر) دەتوانێت مافی خۆی وەرگرێتەوە بەهێز، لەکاتێك دا کەس ناتوانێت مافی لێوەر بگرێتەوە.

وا دا دەنرێت کە پەیوەندی نێوان قەرزداروو خاوەن قەرز لەدێهات دا وەك پەیوەندی نێوان سەر کەوتن ودۆڕان وایە لەبیابان دا بەشێوەیەك پیاوی دۆڕاو هەست بەسەر شۆڕی دەکات و وە پیاوی سەرکەوتوو هەست بەشانازی دەکات، وەلەڕوانگەی خەلکی دێهاتەوە پیاوەتی ئەوەیە کەقەرز وەربگرێت و نەی دەیتەوە.

وە تێبینی ئەوەم کردووە کە ئەم ڕەفتارە گواستراوەتەوە بۆ هەندێك لە دانیشتوانی شار وەك پەتایەك. بەتایبەتی ئەوکەسانەی کەڕەگەزیان دێهاتی یان دەشتەکی یە، دەیان بینی پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن بۆ سفرەو خوان لە کاتێك دا زۆر قورسە ئەو قەرزە بدەنەوە کەلە سەر شانیانە. وە لەگەڵ ئەوەش دا هەوڵ دەدەن لە چایخانەو ولەچێشتخانەکان دا ڕێزی خەلکی تر بکەن(بدەن) لەگەڵ ئەم ڕەفتارانەیان ئامادەن لەگەڵ حەماڵ وسەوزە فرۆشەکان لەسەر فلسێك دەست بە مقۆ مقۆبکەن.

# پاڵنەری قازانج و ڕەوشت

دکتۆر مەتتا عەقراوی لەکتێبەکەی دا(عێراقی نوێ) ئاماژەی پێداوە ئەوەی لەلای ڕۆژئاوایەکان دەناسرێت بە پاڵنەری قازانج بووە . ڕەوشتێك باڵی کێشاوە بە سەر ڕەوشتی هۆزەکانی عێراق دا، ئەمەش بووە هۆی هەڵ وەشاندنەوەی ڕەوشت یان بەشێوەیەك فێڵ ودرۆ یان دەکرد لەپێناوی قازانج دا.

بەبۆ چونی من ئەم هەڵوەشاندنەوەیە لەڕەوشت دا تەنها بۆ پاڵنەری قازانج ناگەڕێتەوە، هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فەرهەنگەی کەلە دەشتەکیەوە بۆ یان بەجێ ماوە لەڕق لێبوون بۆ پیشەوبۆ کاری دەشتەکی.

ئەوەی بەناوبانگە لەدێهاتەکانی عێراقی کەڕۆڵەکانی هۆزەکان هەموو کارێك ناکەن کەببێتە هۆی کڕین وفرۆشتن. بۆ نمونە ئەوان ڕێگرن لە کردنی سەوزەوات و بەخێو کردنی گامێش وڕاوکردنی ماسی بە تۆڕ. چونکە ئەوان دەزانن کەئەم کارانە دەبێتە هۆی گەشە سەندنی کاری میوە فرۆشی. (میوە فرۆش لای ئەوان کەسێکی بێز راوە بەڕوانگەی ئەوان

کەسی میوە فرۆش کەسێکی ناتەواوە. بۆیە لەگەڵیدا دانانیشن و ژن وو ژن خوازی لەگەڵ دا ناکەن).

جارێك یان پیاوێکی دیهاتی لەرۆڵەی هۆزەکانی عێراقیم بینی کەمێك لە سەوزەی پێ بوو بۆ فرۆشتن، خەڵکی گاڵتەیان پێدە کردو ناوناتۆرەی( خبیس)( پیس و چەپەڵ)یان پێدەوت، وە ئەو پیاو بۆ هەڵهاتن لەو شورەیی یە هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەم دا نەمابوویە وە. دکتۆر شاکر سەلیم پرسی لەیەکێك لەپیاو ماقوڵانی دێی(الجبایش) لە هۆکاری ئەوەی خەڵکی ڕقیان لە کشتوکاڵ کردنی سەوزەواتە وە وەڵامی دایەوە کە ئەم پیاوە شمەکەکەی ئەگێڕێنێت بەناو خەڵکی دا بۆ فرۆشتن وە ئەمەش شووروەیی یە.

هەروەها ڕقیان لەو کەسانەیە کە پیشەی چنینیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە. واتە ئەو کەسەی کەخەریکی چنین وەمیوە فرۆشە. پرسیار لەکەسێك کرا هۆکاری نهێنی ڕق لێبون بەرامبەر ئەو کەسەی کە خەریکی چنینە چی یە؟ لە وەڵام دا وتی (ئەم جۆرە کەسانە قۆ پچەکانی "حوسەینی کوڕی علی"یان دزیوە و شایەتی درۆ یان داوە لە دژی (مریم العذراء). من پێم وایە ئەو کەسانەی سەرقاڵی چنینن نە قۆپچەیان دزیوەو نە شایەتی درۆشیان داوە. هەمور ئەوەی کە کردویانە ئەوەیە کەلەنێو خەڵکێك دا ژیاون ڕقیان لەهەمور جۆرە کارێکی دەستی وپیشەی بازرگانی بووە.

لێرەدا کەمێك هەڵوەستە دەکەین وەدەپرسین لەو بەهایانە کە چۆن دەتوانن بمێننەوە لەبەرامبەر ئەو بارودۆخە شارستانی یە نوێ یە کە بەرەبەرە باڵی کێشاوە بەسەر دێهاتەکانی عێراق دا؟ وە ئایا ڕۆڵەی هۆزەکان دەتوانن ڕێگر بن لەبەر دەم پسپۆڕ بوون لە بازرگانی دا. یاخود پسپۆڕ بوون لەکارە دەستی یەکان لەکاتێك دا کە لەبارودۆخێکی ئابووری خراپ دابوون ؟

نکۆڵی ناکەین کە زۆرێك لەخەڵکی دێهات تا ئێستا پەیوەستن بەبەهاکۆنەکانیانەوە ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەناڵێنن بەدەست هەژاری و بێ بەشیەوە. وەدەیان بینی لە سەر ناڕەحەتی ئارام دەگرن وباروی بژێوی لەنێوان خۆیان دا بەش دەکەن بەبێ ئەوەی ملکەچ بکەن بۆ ئەو پیشانەی کەرقیان لێیانە. بەلاّم ئەو خەڵکانە بەرەبەرە توشی دڵە ڕاوکێ بوون لەژێر کاریگەری بارو دۆخی شارستانی کە دەوری داون وتەنگی پێ هەڵچنیوون.

مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی حەز دەکات لەنێوان خەڵکی دا بەرێز بێت وە پێی باشە هەژارێکی بەرێز بێت تا دەوڵەمەندێك بێت کە بێرێز بێت ورقیان لێ بێتەوە. بەلاّم ئەم هەژار بوونەش سنورێکی دیاری کراوی خۆی هەیە. پێویستی ئابوری هەندێکجار پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ شکاندنی بەر بەست وتەگەرەکان. لەڕاستی دا ئەمەش لەنێو خەڵکی دێهاتی عێراقیدا ڕویدا. بەرەبەرە گاڵتە بەبەها کۆنەکانیان دەکەن دەستیان کرد بە پسپۆڕ بوو لەوکارانەی کە قازانجی زۆری تێدایە ئەمە سەرەڕای ئەوەی

کە کۆمەڵگە بەچاوێکی سوك سەیری دەکردن. بەواتایەکی دیکە سەروەت و سامان یان پێ باشترە تا خانەدانی. ئەم کارەش لەسروشتیاندا دەبێتە هۆی بلاوبونەوەی کەمتەرخەمی لە رەوشت لەنێوانیاندا.

*لە زانستی دەرون ناسی دا دەوترێت (ئەگەر مرۆڤ بوترێت جارێك کارێکی حەرام بکات، ئەوا ئاسانە بۆ جاری دووەم و سێ یەم ئەوتارانە بکاتەوە). ئەم رەوشتە ئێستا لەنێو خەڵکی دێهاتی عێراقی دا رووەدات، بەتایبەتی لەنێو ئەوکەسانەی کەلەم دوایانەدا بەرەو شارەکان کۆچ دەکەن، ئەوکەسانەی ئێستا بەرەو شارەکان کۆچ دەکەن زۆرینەن.*

*ئەم خەڵکانە چێژی حەرامیان کردووەو خۆشیان تێی دا دۆزیوەتەوە. مەبەستم لە حەلاڵ دەرچوونە لەو بەهایانەی کە بۆیان بەجێ ماوە. وە هەموو قازانجێك کەبەدەستی دەهێنن زیاتر پاڵیان پێوە دەنێت بۆ رۆچوون بەنێو حەرام دا، تا لەکۆتایدا وایان لێ دێت گوێ نەدەن بەهەموو بەهاکۆن ونوێ یەکان. ئەو رتەیەیان بەسەردا دەسەپێت کە دەڵێت:( لەهەردوو رۆشتنەکە بێ بەش بوون) واتە وازیان لەبەهاکۆنەکان وبەها نوێ یەکانیش هێناوە.*

پاڵنەری قازانج باڵی کێشاوە بەسەر رەوشتیاندا، بەلاّم خەڵکی دێهات بە شێوازێکی جیاواز لێی تێدەگەن وەك لە بازرگانێك لەولاتە شارستانیەکان، بازرگانی شارستانی بازرگانیەکەی لەسەر بنەمای رازیکردنی کریار بنیاد دەنێت. وە لەسەر ئەو پرنسیپە دەروات کە

دەڵێت:(*همیشه کریار لسعر حقه*) . چونکه بازرگان دەزانێت که بەروی بازرگانی یەکەی لەرازی کردنی کریارەکانی دایه ور هەروەها باشی ناوبانگی لەنێوانیان دا.

بەلام لەلای خەلکی دیهات پالنەری قازانج هانیان دەدات بۆ فێلّ کردن لەکریار و قۆستنەوەیان بەبێ گوێ دانە داهاتوریان. ئەوان بەوشێوەیە سەیری کریار دەکەن هەروەك چۆن باوباپیری دەشتەکیان سەیری ئەوکەسانەیان دەکرد که زۆران بازیان لەگەڵ دا دەکردن. وە پێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێت که کریار هەمان ئەو رەوشتەی تێدایە که چۆن فرۆشیار هەیەتی بۆیە ئەم تالّ و گۆرکردنە شێوەی (زۆران بازی) وەردەگرێت کەهەریەکەیان هەوڵ دەدات تیایدا سەرکەوتوو بێت و دڵ گران دەبێت ئەگەر بەدۆراوی بێتە دەرەوە لێی.

ئەگە هەرکەسێك بگەرێت بەنێو بازارەکانی عێراق دا ئەم رستە نوسراوە لەدوکانەکاندا دەبینێت(فرۆشراو وەرناگیرێتەوە.قەرزقەدەغەیە، رزقیش لەلای خوداوەیە).

من نازانم چۆن خودا بەزەی بەکەسێك دا دێتەوە که بەقەرز شمەك نافرۆشێت وفرۆشراو وەرناگرێتەوە؟؟

ئەم دەستەواژانە ئەو چەمکەی دەشتەکیەتمان بیر دەخاتەوە له بارەی رزقەوە. رزق لەلای خوداوە دێت ودوای ئەوە رازی بوون و تورەبوونی کریار هیچ گرنگ نی یە. له بازارەکانی عێراق دا دەگمەن نی یه ئەگەر مقۆ مقۆ روودات لەنێوان کریاروو فرۆشیاردا. زۆرجار فرۆشیار نایەوێت راز

لەو قازانجە بهێنێت کەبە شمشێری ماملە بەدەستی هێناوە، وە هەروەها کڕیاری دۆڕاویش نایەوێت بە دۆڕاوی بمێنێتەوە وە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی زڵلەو بۆ کس لەیەکتروەشاندن.

کاریگەری ئەم ڕەوشتە تەنها لەبواری کڕین وفرۆشتن دانی یە بەڵکو هەندێك جار بواری پیشە دەستی یەکانیش دەگرێتەوە. تۆ ئەگەر بتەوێت (خاوەن پیشەیەك) بۆ کارێك بەکرێ بگریت ئەگەر چاودێری نەکەیت لەکارەکەی دا تەمەڵی دەکات یان هەوڵ دەدات فێڵت لێ بکات. ئەو هەستە دۆڕاوەی کەلە باوباپیرانی یەوە بۆی بەجێ ماوە ڕێگر دەبێت لەوەی بەشێوەیەکی باش کارەکانی جێبەجێ بکات. دوای ئەوە گوێ ناداتە ئەوەی کەسوێندت بۆ بخوات کەلەکارەکەیدا دڵسۆز بووە بۆت!

## ون بوون لەڕەوشتی شارەکان دا

زۆربەی وتەکانی پێشومان لەبارەی ون بوو لەڕەوشتی دێهاتەکانی عێراق دا بوو، ئەوەی شایانی ئاماژە بۆ کردنە لێرەدا ئەوەیە کە خەڵکی دێهاتەکان زۆرینەی دانیشتوان پێك دەهێننت. وە دەتوانین بڵێین لە سەدا شەستی دانیشتوانی عێراق گوند نشینن یاخود بەجۆرێك لە جۆرەکانی پەیوەندیان بە دێهاتەکانی عێراقەوە هەیە.

ئەوەی ماوەتەوە کەمێ‌ بڵێین لەبارەی ونبوو لەڕەوشتی خەڵکی شارەکان دا. بۆ ئەوەی لەم مەبەستە بگەین پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی عوسمانی، ئەو سەردەمەی کە عێراق کەوتبووە ژێر باری عوسمانی یەکانەوە تا جەنگی جیهانی یەکەم ، تائێستاش زۆرینەی خەڵکی عێراق بە یادەوەریەکان وئەوفەرهەنگە کەلە بەهاکۆمەلایەتی یەکان بۆ یانبەجێ ماوە دەژین.

بابەتی لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی شارەکانی عێراق لەسەردەمی عوسمانی بابەتێکی ئاڵۆزو دوورودرێژە. ئێستا دەرفەتی ئەوەمان نی یە ڕۆبچینە ناویەوە. لێرە دا ئەوەندە بەسە بڵێین کە خەڵکی شارەکانی

ئەوکات دڵنیا نەبوون لەتوانای دەوڵەت لەپاراستنی گیان وماڵیان، لە ئەنجامی ئەوە دا ناچار بوون جۆرێك لە(پارچە پارچە) بونی هۆزایەتی دروست بکەن بۆ دورخستنەوەی تالاَن وکوشتن لە خۆیان کە ئەو سەردەمە باو بوو . لێرەوە هەر گەڕەکێکی شار وەك هۆزێکی لێهات کە سەرزکێکی تایبەت بە خۆی هەبێت و مێژوویەکی پڕ لە شانازی بەپیاوەتی وئازایەتی هەبێت.

بە تێپەڕ بوونی کات لە عێراق دا کە شەڕ لەنێوان گەڕەکەکانی شاردا هەڵدەگیرسا هەروەك چۆن شەڕ لەنێوان هۆزەکانی دێهات وهۆزەکانی بیابان هەڵدەگیرسا. وە ئەگەر کەسێك لەگەڕەکێك دا بکوژرایە بەدەستی کەسی گەڕەکێکی تر ئەوا خەڵکی گەڕەکەکە داوای تۆڵە سەندنەوەیان دەکرد یاخود پەنایان دەبردە بەر کەسێکی شارەزا لە دابونەریتی هۆزایەتی دا.

جوامێری هۆزایەتی لەشاردا گۆڕا بۆ جوامێری گەڕەك. خەڵکی بانگی ڕۆڵەی گەڕەکەکەیان دەکرد بە( ڕۆڵەی لایەنی) خۆمان. وە پێویست بوو لەسەر پیاو کە بەرگری لە(ڕۆڵەی لایەنەکەی) خۆی بکات یاخود تۆڵەی بۆ بسێنێتەوە ئەگەر ستەم کار بوایە یاخود ستەم لێکراوو.

پەروەردەکردن ئەم دەمارگیریەی گەڕەکی لەشارەکان دا دووپات دەکردەوە. منداڵان لەکۆلانەکاندا لەکاتی یاری کردن دا دەمارگیری

گەرەکیان پیادە دەکرد. خۆشترین یاری لەلایان ئەوە بوو کەشەڕ لەگەڵ
مندالانی گەڕەکێکی تر بکەن وبیان شکێنن. زۆربەی وتەی مندالان
لەبارەی ئەو پاڵەوانیەتانەوە بوو کەگەڕەکەکەیان بە دەست یان هێنا بوو
بەرامبەر گەڕەکەکانی تر. وە زۆر مەحاڵ بوو منداڵێك بتوانێت بچێتە
گەڕەکێکی تر بەبێ پاسەوانی. مندالانی هەر گەڕەکێك کۆمەڵێك یان
پێك دەهێناو پەلاماری بێستانەکانیان دەدا بۆ دزینی میوە، چێژێکی
گەورەیان دەبینی لەم دزی کردنە. چونکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەمە
بەڵگەیەك بوو بۆ ئازایەتیان. وە زۆر ڕق یان لە منداڵێك بوو کەنە دزی
ونە دەست درێژی بکات. چونکە ئەو منداڵە لاوازە بۆیە دەکەوتە ژێر باری
منداڵە بەهێزەکانەوە و سوکایەتیان پێ دەکرد.

ئەگەر ئەو منداڵانە گەورە بونایە بگەیشتنایەتە ئاستی پیارەتی
بەروانینی هێزو لاوازی دەیان ڕوانیە ژیان یاخود بەروانینی پیارەتی
وناپیاوی.(ئەوکات خەڵکت دەبینی کەرێزیان لەپیاوی دەست درێژی کار
دەگرت کە دزی لەماڵی خەڵکی دەکردوو خوێنی دەرشت و کاتێکی
درێژی لەبەندیخانە بەسەر دەبرد).

لە هەموو گەڕەکێك دا پیاوانێك هەبوون کەشایان بوون بێن بە پاڵەوان.
گەڕەك شانازی پێوە دەکردن لەبەرامبەر گەڕەکەکانی تر. پاڵەوان خوێن
ڕێژترین کەس بوو بە نیسبەت دوژمنی گەڕەکەکەیەوە بەلام لەهەمان
کات دا خاوەن شەهامەت بوو بۆ هاورێکانی وبۆ ڕۆڵەی گەڕەکەکەی

خۆی. هەرکەسێك پەنای بۆ بېردایە فریای دەکەوت. دوای ئەوە سمێڵی خۆی بادەدا.

پیاوێکی بەتەمەن دەناسم لەڕۆژەکانی ئەوەی ڕابردوو. هەموو جارێك لەگەڵی دادەنیشم وگوێ لەیادەوەریەکانی ڕۆژانی ڕابردووی دەگرم. ئەو سەیری ئەو گەنجانە دەکات کەبەبەردەمیدا تێدەپەڕن ئاخ لەسەر ئاخ هەڵدەکێشێت بۆ ئەو ڕۆژانەی کەپیاو تێی دا پیاو بوو پڕ بەماناکەی، پیاوانی ئەو سەردەمە وەك پیاوانی ئەم سەردەمە نەبوون کەناتوانن مریشکێك سەر ببڕن. هەموو مەراقیان تاشینی سمێڵ وداهێنانی قژو دواتریش چوون یانە بەدەوری ژنان.

ئەو بەئاخ و حەسرەتەوە دەڵێت (پیاوو مردن) ئەو مەبەستی لەپیاوان ئەو کەسانەیە کەدڵیان پڕ بوو لە جوامێری وپیاوەتی، هەرکە دەنگی یار مەتیان دەبیست لەهاوڕێکەیان یەك سەرخەنجەریان هەڵدەکێشا بەبێ ئەوە لە هۆکارەکەی بپرسن هەروەك شاعیری دەشتەکی کۆن دەڵێت:

*( لەبراکەیان ناپرسن کاتێك پەنایان بۆ دەبـــــەن*
*لەپێنا بردنیاندا پێویستیان بەبەڵگە هێنانەوە نەبوو)*

هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە لەیەکێك لەپیاوانی ئەو سەردەمە کە شەڕێك دایان بەسەر ماڵێك دا هەرچی قاپ وپێویستی ماڵەکە بوو کۆیان

دەكردەوە. ژنی ماڵەكە هەستی پێكردن بەترسەوە كوڕەكەی لەخەو ڕاپەڕاند و پێی ووت (هەستەیارمەتی خاڵۆیانت بدە بۆ هەڵگرتنی ئەوەی كەدزیویانە. سەردەستەی دزەكان ئەم وتەیەی بیست فەرمانی دا واز لەدزی ئەو ژنە بهێنن. چونكە دزەكان بوونە برایەو خاڵی كوڕەكەی)وەرێگە نادرێت لەیاسای پیاوەتی وسوارچاكی دا كە دزی لەخوشك ورۆڵەكانی بكرێت.

ئەمەرەوشتی پیاوانی ئەورۆژانە بوو! ئەمە ئەو وتەیەبوو كەهاورێكەم بۆی گێرامەوە لەپێوز كردنی پیاوانی ڕابردوودا. ئەو پیاوەتی ئەو كەسانەمان بیر دەخاتەوە و دزی ئەوانی بیر دەچێتەوە. وە لەوانەیە دزی كردنیش یان بەشانازی كردن بچوێنێت، چونكە ئەو دزیە ئاماژەیە بۆ ئازایەتی چونكە ترسنۆك ناتوانێت دزی بكات یاخود بدات بەسەر ماڵاندا.

## ڕەوشت لە دواساتەکانی دا(لەگیان دەرچون دا)

ئەوەی کەباسمانکرد بارودۆخی ڕەوشت بوو لەشارەکانی عێراق دا، پێش جەنگی جیهانی یەکەم، ئەو ڕۆژانەی کەعێراق کەوتبووە ژێر باری دەستەلاتی عوسمانی. وەنکۆڵی لەوە ناکەم کە ئەم بارو دۆخە دەستی کرد بەگۆڕان لەژێر کاریگەری بارو دۆخی نوێ دا. هەروەها ئەوەی کەپێویستە دانی پێدابنێم ئەوەیە کەهەندێك لە بەها کۆنەکان تا ئێستاش دەبینرێن لێرەو لەوێ بەتایبەتی لەو ناوچانەی کەکاریگەرنەبوون بەبارودۆخی نوێ. بەشێوەیەکی گەورە ئەم کارەش هەروا ئاسان نی یە چارپۆشی لێبکرێت. بەها کۆمەلایەتیەکان بەشێوەیەکی گشتی بەئاسانی لە دڵ و دەرونی خەلکی دا نارەوێتەوە بەکتوپڕی. ئەم بەهایانە ڕۆچوون بەناخی نەست دا، کەسورە لەسەر مانەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ بەشێوەیەك کە کاریگەری دەبێت لەئاراستە کردنی هەڵس وکەوتی مرۆڤ دا، سەرەڕای گۆڕانی بارو دۆخی گونجاو بۆ ئەو بەهایانە.

ئەوەی ئەمڕۆ بەبازاڕەکۆنەکانی شارەکانی عێراق دا بگەڕێت خەڵکانێك دەبینێت تائێستاش شانازی دەکەن لەسەر ئەو شێوازەی کەلەسەردەمانی رابردوو دا لەسەری ڕاهاتبوون. تائێستاش چایخانەکان پڕن لە وکەسانەی کەقسە دەکەن دەربارەی ئازاوو ترسنۆك سەرکەوتوو دۆڕاو بەشێوە یەك کە لە بنەڕەت دا هیچ جیاوازیەکی نی یە لەگەڵ باسەکانی دەشتەکیەت.

*دەیان بینین پەیوەستن بە بیروباوەڕە ئاینیەکەیانەوە پەیوەست بوونێکی بەهێز، پێغەمبەرو هاوەڵەکانی پیرۆز دەکەن پیرۆز بوونێکی بێسنور. وە دەست درێژی دەکەنە سەر هەرکەسێك کە گومانی هەبێت لەڕاستی بیروباوەڕەکەیان یاخود گاڵتە بەپێغەمبەر وهاوەڵەکانی بکات. بەڵام لەهەمان کاتدا ڕێزی ئەو کەسە ناگرن کە لەڕەوشتی دا شوێنی پێغەمبەرو هاوەڵەکانی بکەوێت. بۆ نمونە ئەگەربیارێك ویستی پابەند بێت بە ڕەوشتەکانی پێغەمبەران وەڵامی ئازار بەلێبووردن بداتەوەو وە خراپە بەچاکە ئەمە بە ڕەوشتی کەسێکی لاواز دادەنێن وبەچاوێکی ڕق لێبون سەیری دەکەن.*

دەیان بینی کاتێك یەکێك قسەیان بۆ دەکات لەبارەی ترسی خواداوە ئەوا خوداترسیان دەردەبڕن وفرمێسك دەڕێژن. بەڵام کاتێك لەگەڵ هاوەڵەکانیان کۆ دەبنەوە باس لە پەلامارو دەست درێژیەکانیان دەکەن رچۆن فێڵیان لەفڵانەکەس کرد یاخود چاوی فڵانە کەسیان تەقاند. وەکاتێك ئەمە دەگێڕنەوە شانازی دەکەن ویرپ بەدەمیان پێدەکەنن.

ئەوان پرسیار لە سودی کرداری هیچ کەسێك ناکەن کە کردبێتی. لای ئەوان گرنگ ئەوەیە بەهەر شێوە یەك بێت سەرکەوتوو بێت. چونکە ئەمە لای ئەوان لەرِوالّەتەکانی پیاوەتی یە. ئەم حالّەتە بە ئاشکرا دەردەکەوێت لەبابەتی دەست درێژ سێکسی دا. لەرِۆژئاوا خەلّك دەبینین ماملّە لەگەلّ لادەری سێکسی دا دەکات بەجۆرێك لە سۆز، چونکە ئەو کەسە بەئەخۆش دادەنێن ڕێنویستی بە چارسەر هەیە. هیچ جیاوازیەك ناکەن لەنێوان لادەری سلبی ولادەری ئیجابی. وە ئاشکرایە لەهەندێك نەتەوە پێشکەوتووەکان دا زیاتر سەرزەنشتی لادەری ئیجابی دەکەن تا لادەری سلبی، بەشێوەیەك لادەری ئیجابی دادەنێن بەهۆکار و لادەری سلبیش بەئەنجام دادەنێن. بەلاّم لای کەسانی ئێمە بەپێچەوانەی رۆژئاوایەکان سەیری ئەم کارە دەکرێت. زیاتر رِقیان لەلادەری سلبی یە لەکاتێك دا بە چاوی رێزەوە سەیری لادەری ئیجابی دەکەن. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان لادەری ئیجابی کەسی سەرکەوتووە. هاوار بۆ ئەو کەسانەی کەلەم بوارەدا دۆراون چونکە لە دابوونەریتی ئەوان دا بە سەرشۆری دەمێنێتەوە وە ناوێرێت سەر بەرزبکاتەوە بۆ ماوە یەکی دوورودرێژ.

ئەوان بەم رِوانینە دووفاقیەوە سەیری(داوێن پیسی) دەکەن. جێگەی شانازیە بۆ پیاو ئەگەر لەگەلّ ژنی خەلکی دا "داوێن پیسی" بکات، وە جێگەی شووریی یە ئەگەر یەکێك لەژنەکانی داوێن پیسی لەگەلّ کەسێکی دیکە دا بکات. وە زۆر جار ژنان دەکەونە ژێر باری ئەم کارەوە، خەلکی لەدەشتەکیەتەوە بۆ یان مارەتەوە رِق یان لەنافرەت بێت و

بیکوژن ئەگەرگومانیان لەهەڵس وکەوتی کرد. لەبەر ئەوە کوشتنی ئافرەتان لەعێراق دا بووەتە دیاردەیەکی کۆمەلآیەتی کە جێگەی سەرنجە. وە ڕۆژێك تێناپەڕێت کەهەواڵی کوشتنی ژنێك نەبیستین بۆ پاك کردنەوەی شەرەف. دواتر خەنجەرە خوێناویەکەی دەداتە دەست پۆلیس.

کورتەی ئەم بابەتە ئەوەیە کەبەوشت لەعێراق دا هێشتا لەناخی دا هەندێك لەبەهاکانی دەشتەکی هەڵگرتووە لەڕیز گرتن لەسەرکەوتن و ڕق لێبوون لە دزراو. بەلآم ئەم بەهایانە یێکەڵکن بەشێوەیەك کەلەژینگە سەرەتایەکەیانەوە هاتنە دەرەوەو فەرمانە کۆمەلآیەتیەکەیان لەدەست دا. بەڵکو ئاراستەکردنی هەڵس وکەوتی مایەوە وەك گرتیەکی دەروونی بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێکی هەبێت کەلەگەڵ ئەم ژینگە نوێ یەدا بگونجێنت.

# دواتێبینی یەکان

پێش ئەوەی بابەتەکەم کۆتای پێ بێنم پێویستە هەندێك تێبینی بنوسم کە پێویستن بۆ بابەتەکە کە چوار تێبینین:

*تێبینی یەکەم:* هەروەك پێش تر ووتم ئەم بابەتەم چڕ کردووەتەوە لەچوار چێوەی ململانێی نێوان دەشتەکیەت وشارستانیەت. ئەوەی شایانی وەبیر هێنانەوەیە ئەم بابەتە ناتوانێت هەموو بابەتەکانی وون بوو لەسەرچاوە ڕەوشتیەکان لەخۆبگرێت. لایەنی دیکە هەن کەلەوانەیە لەم بابەتانە گرنگتر بن کە بەبیرم هێنابنەوە. بەڵام مەبەستم لەم چڕکردنەوەیە سەرنج ڕاکێشانتانە بۆ لایەنێك کە وای دەبینم پشت گوێ خراوە لەلایەن زۆرێك لە برا لێکۆڵەرە کۆمەلایەتی یەکان لە وڵاتانی عەرەبی. *هیوا دارم هەل بۆ من یان بۆ لێکۆڵەرانی تر بڕە خسێت بۆ لێکۆڵینەوە لەوون بوو لەڕەوشتەکانی عەرەبی دا بەوەی کە پەیوەندی هەیە بەململانێی ئاینەکان وبیروباوەڕەکان یاخود بەوەی کەپەیوەندی هەیە بە شارستانیەتی*

*ڕۆژئاراوە کە خەریکە دزە دەکاتە نێوو جیهانی عەرەبی وکاریگەری دەبێت لەکارو بارەکۆمەلآیەتی یە جۆر بەجۆرەکان دا.*

*تێبینی دووەم:* ئەم لیکۆلینەوەی من لایەنێك لە ڕەوشتمان بۆدەنوێنێت. لەوانەیە خالی نەبێت لە پیاهەلدان یاخود کەم وکوڕی. وە پاساوی منیش لەم بوارەدا ئەوەیە، لەلایەن لیژنەی لێکۆلینەوەکانی عەرەبی ڕاسپێردراوم کەلیکۆلینەوە لەسەر "ونبوو" لە سەرچاوە ڕەوشتیەکان بکەم. وە من ئەگەر بەم لیکۆلینەوەیە ڕانە سپێردرابامایە ئەوا لەوانە بوو ئەم لێکۆلینەوەی من شێوازێکی تری لەخۆدەگرت وەك لەوەی کەئێستابینیتان. لایەنێکی دیکەمان هەیە ئەمەوێت سەرنجتانی بۆ ڕاکێشم ئەویش ئەوەیە کەسەردەمی بەگەورەڕاگرتنی نەتەوەیی تێپەڕیوەوو لە جێگەی دا سەردەمی تورێژینەوە لە چارەسەرە کۆمەلآیەتی یەکان و گەڕان بەشوێن ڕاستی یەکاندا جێگەی گرتوەتەوە، هەر چەندە تاڵەوزیانی هەیە بۆ مان ئەگەر بەردەوام ستایشی خۆمان بکەین ونەتەوەکەمان بەباشترین نەتەوە دابنێین و ڕەوشتیشمان لە هەموو ڕەوشتەکان بەباشتر بزانین. ئەگەر ئەو نوسراوانە بخوێنینەوە کەلیکۆلەرە ڕۆژئارایەکان دەی نوسن لەسەر کەم وکوڕی کۆمەلگاکەیان و وون بوو لە ڕەوشتیان دا دەبینین خراپترین دیاردە باس دەکەن. ئەو کۆمەلگەیەی کە نکۆلی لە نەخۆشیەکانی دەکات وەك ئەو کەسەوایە کە نەخۆشی دزە بکاتە نێوو سیەکانی ونەیەوێت گوێ لە ئامۆژگاریەکانی پزیشك بگرێت.

*تێبینی سێیەم:* ئەم بابەتەم تەنها بۆ لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگەی عێراقیم تەرخان کردووە. دەترسم برایانم لەخەڵکی عێراق لێم زویر بن ، وادادەنێم کەئەم توێژینەوەیەم دەبیستن بڵێن کەمن( دەست ئەنقەست) عێراقم ئابڕوو بردووە لەبەردەم وولاتانی دیکەدا. وەگران نی یە لەلام ئەگەر یەکێکیان پێم بڵێت:( براکەم ئابڕووت بردین!!).

لەڕاستی دا من شانازی دەکەم بەوەی کە عێراقیم. بەلام لەگەڵ ئەوەش دا لەلێکۆڵینەوەکانم دا شوێن بیروباوەڕێکی (صۆفیەت) دەکەوم کە دەڵێت:(خوایە ئابڕومان بەرە بەلام عەیب وعارەکانمان پەردە پۆش مەکە) وە هیوادارم لێکۆڵەرە کۆمەلایەتیەکان لەولاتانی دیکەی عەرەبی لەسەر ئەم پڕەنسیپە بڕۆن کە کەم کوڕی کۆمەڵگەکەیان بخەنە ڕوو بەبێ دوو دلی،(چونکە لە زانست دا شەرم نی یە). گومانم لەوە نی یە کە ئەگەر لێکۆڵینەوە بکەین لە بارو دۆخی ولاتانی دیکەی عەرەبی ئەوەندە کەم وکوڕی و نەخۆشی کۆمەلایەتی دەبینین بەجۆرێك لەجۆرەکان هیچی کەمتر نی یە لەوەی کە لەعێراق دا بینیمان.

*تێبینی چوارەم:* من ئەم لێکۆڵینەوەیەم تەرخان کردووە بۆ باسکردنی نەخۆشی بەبێ ئەوەی باس لەچارە سەر کردن بکەین، چونکە هەرکاتێك کە زانیمان ئەو هۆکارانە چین کە بوونەتە هۆی سەر هەڵدانی ئەم نەخۆشی یە کۆمەلایەتیانە ئەوا بەر پرسیاریەتی چارەسەر کردنی ئەم نەخۆشیانە نەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت، چونکە دەوڵەت دەتوانێت پلانێکی تۆکمە دابنێت تاوا لەخەڵکی بکات کەلەپوری دەشتەکیان لە بیر بچێتەوەو

هەوڵی داهێنانی بەهای نوێ بدەن کە شارستانیەتی جیهانی ئەمڕۆی لەسەر دامەزراوە.

بۆ نمونە دەوڵەت دەتوانێت دەربەگایەتی لەدێهاتەکان دا نەهێڵێت، وە لەجێگەی دەربەگایەتی خاوەنداریەتی تایبەت بلاو بکاتەوە و ڕێگر بێت لەبەردەم ئازاردانی سورخۆرەکان لەرێگەی هارکاری ڕێکخراوەکان و ئەرزو"سولفەی" کشتو کاڵی" بەشێوەیەك وا لەئاکی دێهاتی بکات کە هەست بە حەزی دەست بەسەراگرتن و سەرکەوتووی نەکات کەلەرابردوو دا بۆی بەجێما بوو کەئێستا هیچ سودێکی بۆ ژیان نابێت. گرنگی دان بەبەرهەم هێنان و بەدەست هێنانی ڕەوشتی گونجاو بۆ خۆی تەنها ڕێگەیەکە دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی سەر کەوتوی و ڕێز لە ژیان دا.

مامۆستا حەلیم نەجارِ لەکتێبەکەی دا( کەلەپوری کۆمەلایەتی مان و کاریگەری لەسەر کشتوکاڵ) دەمان دوێنێت لە بارەی دێیەکی بچووك لە نزیك(معرە النعمان) لەسوریا، کە تێی دا جوتیاران خاوەنی زەوین و بۆ خۆیان وەبەری دەهێنن. واتە خاوەن داریەتی بچوك تێی دا بلاوە، لەکاتێك دا دێهاتەکانی دەوروو بەری لەژێر باری ڕژێمی دەربەگایەتی دا دەژین. مامۆستا (نەجار) دەڵێت کەڕەوشتی خەلکی ئەو دێهاتە سەرنج ڕادەکێشێت بەشێوەیەك کە خەلکەکەی بە گەورەیی و بەرێزی ڕەوشت وڕاستگۆی مامەلە کردن دەناسرێن. ئەمە سەرەڕای چالاکیەکانی دیکەیان و خۆراگری و ئاواتەکانیان. بەلام دانیشتوانی دێهاتەکانی

دەورووو بەری تریان کەهیچ جیاوازیان نی یە لەناین و زانست وڕەگەزیان لە دانیشتوانی ئەو دیهاتە بەلاّم ڕەوشتیان وەك یەك نی یە.

*ئێمە ناتوانین چاك سازی لە ڕەوشتی خەڵکی دا بکەین لە ڕێگەی ووتارو ناسۆژگاریەکانەوە هەروەك چۆن پێشینان دەیان کرد. (ڕەوشت لە دایك بووی بارودۆخێکی کۆمەلاّیەتی یە کەتێیی دایە، تا ئەو بارودۆخە گۆڕانی بەسەر دانەیەت ئەوا هیچ هیوایەك نی یە بۆ گۆڕانی ڕەوشت وەك ئەوەی کەدەمانەوێت). وبەمەش ئەو ووتەیە ڕاست دەبێت کە دەڵێت:( ژیانی مرۆڤ بگۆڕە ڕەوشتی دەگۆڕدری*

# عەلی وەردی....پاشماوەی ڕوناکی لەناو جەرگەی تاریکی عێراقی

"سعد هادی"

عەلی وەردی وای دادەنا کەکۆمەڵگەی عێراقی بریتی یە لەململانێی نێوان دەشتەکیەت وشارستانیەت. دوای 13ساڵ لەکۆچی دوای عەلی وەردی هێشتا تەوێن هاوتاوو هەنورکەیی بەو جێی گفتوگۆو لێکۆڵینەوە یە. کتێبێکی نوێ تیشك دەخاتە سەر ئەم بیرمەندەزانایە کە توندڕەوەکان گۆڕەکەیان هەڵکەند دوایی داگیرکردنی ئەمریکا لە عێراق. عەلی وەردی لەماوەی ژیانی دا 1913 -1995 هەوڵی دا شیکارێکی بابەتی پێشکەش بکات لەسەر کۆمەڵگەی عێراقی بە پشت بەستن بە سێ گریمانە:

1- ململانێی نێوان دەشتەکی و شارستانیەت.

2- دووفاقیەی کەسێتی

3- ناسازی کۆمەڵایەتی

عەلی وەردی کە لە بەیروت خوێندویەتی و دواتر لە زانکۆی تەکساس بەیەکێك لەو نووسەرە عێراقی یە دادەنرێت کە جەماوەری خۆی بوویێت،

ئەم مێژوونوس و زانا کۆمەڵناسە کە بەبابەتەکانی بە میانڕەوی ناسراوە، بە یەکێك لە پێشەنگەکانی عیلمانیەت لە عێراق دادەنرێت. بەردەوام جێگەی دیالۆکە لەنێوان ناکۆکەکان و لایەنگرەکانی دا، میتۆدەکەی کە پشتی دەبەست بە بێ لایەنی لە ڕوونکردنەوە، ڕاستی یەکانی مێژوو و ڕواڵەتەکانی ژیانی هاوچەرخ لەلایەن ڕووناکبیرانەوە، کۆمەڵە پرسیارێکی دەورووژاند سەبارەت بە بنچینەکانی دابونەریت، و کاریگەریەکانی لەسەر بیروبۆچوونی تاك و هەڵسوکەوتەکانی، بەبێ ئەوەی هیچ وەلامێکی تەواو پێشکەش بکات، بەلام پیاوانی ئاینی و سەلەفی یەکان، بەچاوی گومانەوە سەیری نوسینەکان و وتەکانیان دەکرد، بەردەوام هەولیان دەدا بۆ لەناوبردنی بیروبۆچوونەکانی (وەردی). تەنانەت هەندێکیان بە دژایەتیکەری پیرۆزیەکان،و گاڵتەکردن و سوکایەتی کردن بە شتە پیرۆزەکانیان دەزانی، کتێبی(من وحی الثمانین) کە دامەزراوەی(البلاغ) دیمشق 2007 دەری کردووە، بەزیادکردنێك دادەنرێت بۆ پاشماوەکانی وەردی، کە لە بلاوکردنەوە وەستا، لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، دوایی هەشت بەرگ لە کتێبە گەورەکەی کورتەیەکی کۆمەلایەتی لە مێژووی عێراقی نوێ نوسرابوو، ئەمیش دوایی تەنگ پێهەڵ چنینی لەلایەن دەسەلاتەوە، چونکە میتۆدی وەردی و شیکاریەکانی جیاوازبوون لەگەڵ ئاراستەگشت گیریەکەی دەسەلات دا، جگە لەهەندێك وتار نەبێت لێرە و لەوێ خاوەنی کتێبی(واعزەکانی سولتان)(گاڵتەجاریەکانی عەقلی مرۆڤ) لەدوایی ئەمانە هیچ کتێبێکی

دیکەی بلاونەکردوەتەوە، تەنها بەبانگەشەکردنی بۆ نوسینی یادەوەریە خێزاکانی. بەلام ئەوانیش بلاونەکراوە دوایی کۆچی وەردی لەگەلّ کتێبێکی دیکە کە دیار نەما بە ناونیشانی (سروشتی مرۆڤ).

کتێبی(من وحی الثمانین)پێشکەش دەکات کە لێکۆلینەوەو وتوێژی لەسەرکردوە، یەکێك لە قوتابیەکانی وەردی بەناوی(سلام شماعە) لێکۆلینەوەی لەبارەی ئەو کتێبە کردوە، بیرە بنەرەتیەکانی وەردی لە زنجیرەیەك گفتوگۆ پێك هاتووە، ئەم رۆژنامەنوسە عێراقی یە هەر خۆی پرسیارەکانی کردووە و خۆیشی وەلامی داونەتەوە. لەسەرتایی سالّی 1990 لە یەکێك لە رۆژنامەکانی عێراقی لە یەکێك لە بابەتەکان دا ئاماژەی بۆ دەکات بە ناونیشانی، پاشماوەی سەردەمی تاریکی، بەلام کێشەی سەرەکی لەگەلّ زۆرێك لە هاوشێوەکانی کە پێوەی دەنالێنن ئەوەیە کە وتاربێژە رەوانبێژەکان خۆیان هەلّ دەقورتێنە ناو هەموو بابەتێك کە هیچی لەبارەوە نازانن، چەکێکی کاریگەیان بەدەستەوەیە کە ئەویش (چەکێکی بریقەدارە) دەست دەکەن بە رەخنەگرتن لە چەمکە نوێیەکان، و کۆمەلێك بەلگەو و رەخنە دەهێننەوە، پشتگیری لە بیروبۆچونەکانیان دەکات، و(شماع)باس لە مێزگردێك دەکات کەئەنجام دراوە لەنێوان عەلی وەردی و هەندێك لەپیاوە ئاینیەکان کە رەخنەیان لە وەردی گرتوە دوایی بلاوبونەوەی کتێبی(واعزەکانی سولتان) کار گەیشتە ئەوەی کە بە لادەریان تۆمەت بارکرد، وەردی لەم مێزگردەی دا بە دورر و درێژی قسەی کرد و دواتر گەرایەوە بۆ مالەکەی، بە پالپشتی

پاسەوانان، لەترسی ئەوەی ئەوەک تووشی دەستدرێژی ببێت، وەردی لەحەمان بەشی واعزەکانی سولتان دا، وا دەبینێت کە سەردەمی تاریکی شەش سەدەی خایاندوە و بەخراپترین سەردەم دادەنرێت کە عێراقی پێ دا تێ پەریوە. بە هەموو ئەو مێژووە دوورود درێژە لەبارەی دابڕان لە شارستانیەت واتە( عێرق لەمیانەی ئەو شەش سەدەیەدا لەشارستانیەت دابڕابوور). وەردی، بەردەوام دەبێت، کە بەها و داب نەریتەکۆمەلایەتی یەکان، کە تێی دا بلاو بووەتەوە، بە کوت و پڕی ون نەبوون، بەلکوو کاریگەریان هەبوو بۆ سەردەمێك کە ماوەکەی کەم نەبووە. لەبەشێکی دیکەدا بەناوی دوو فاقیەتی کەسیەتی، عەلی وەردی، وادەبینێت کە بابەتی دووفاقی خراپ لێ تێگەیشتنە. ئەم دووفاقەیەش تەنها لەناو عێراقیەکان دا نی یە، بەلکو لەناو هەموو کۆمەلگاکان دا بوونی هەیە، بەلام ئەمە بەپێی بارودۆخەکان جیاوازە، لە کۆمەلگەیەك دا ئەم دووفاقیە دروست دەبێت کە دوو جۆر ڕژێمی بەهایی وردەهای جیاوازی تێدابێت، لەم کاتەدا تاك دوو جۆر هەلسوکەوتی کۆمەلایەتی جیاوازی پێ دەگات، یەکێکیان پالی پێوە دەنێت بۆ ڕێزگرتن لە ڕەوشتێکی دیاری کراو، و ڕژێمەکەی دیکەش پالی پێوە دەنێت بۆ ڕەوشتێك جیاوازە لەوی دیکە، تاك لە ژیانی دا دوو جۆر هەلسوکەوتی جیاوازی هەیە کە هەستی پێناکرێت، بەلام سەبارەت بە ململانێی دەشتەکی و شارستانیەت عەلی وەردی وایی دادەنێت کە کۆمەلگەی عێراقی دەرەنجامی ئەو ململانێ یە.

وایی دەبینێت هەر کۆمەڵگەیەك لە کۆتایی دا دەرەنجامی ئەو کۆمەڵگەیە کە پێی دا تێدەپەڕێت، کەکۆنترین گەمارۆی بینیوە لە مێژووی مرۆڤ دا.

عێراق دەکەوێتە سەر بیابانێك کە پڕە لە هۆزی دەشتەکی، ئەم هۆزانە ڕاهاتبوون دزە بکەنە ناو عێراق، هەرجارە کە عێراق دابڕابێت لە شارستانیەت، بۆ ئەوەی دەشتەکیەتی بەسەردا بسەپێنرێت، بۆ وەڵام دانەوەی ئەو کەسانەی کە تاوانباریان کردوە، بەجەختکردنەوە لەسەر، لایەنە خراپەکان، لە وەڵام دا وەردی دەڵێت:(کە تەنها ئەو نی یە بەڵکو باری هەموو لێکۆڵەرەوەکانە لە جیهان دا،کاتێك لێکۆڵینەوە دەکەن لە کێشەی کۆمەڵگەکانیان)، هەروەها مەرجی میتۆدی زانستی واپێویست دەکات. هەروەك و دیارە لە کتێبی(من وحی الثمانین) وەك چاو پیاخشاندنەوەیەکە، کە بە گرنگترین ئەو بابەتانەی کە وەردی گرنگی پێ داوە لەماوەی سی ساڵی تەمەنی دا وەك بیرمەندێك و مرۆڤێك و لێکۆڵەرەوەیەکی کۆمەڵایەتی، کە ئەم کتێبەی زیاتر لە دوا وەستیەکانی دەچێت، لە سایەی نوسینەکانی کە نەی وێراوە بڵاویان بکاتەوە لەماوەی ساڵانی دەسەڵاتداری بەعس دا. باسی بیرو بابەتە بنەڕەتیەکانی بۆ هاوڕێکان و موریدەکانی دەکرد، کەکەس نازانێت ئەو بابەتانە لەکوێن، ئەگەر وەردی، بەردەوام توشی تیۆری مەعنەوەی بوبێت ئەوا لە دوایی داگیرکردنی ئەمریکا توشی تیۆرێکی دیکە بوریەوە لە جۆرێکی دیکە،کە گۆڕەکەی هەڵکەنرایەوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە گۆڕەکانی ڕۆڵەکانی

تری عێراق. کاتێك یەکێك لەڕێکخراوە نایینیەکان دەستی گرت بەسەر مقامی(برانا) ئەو شوێنەی کە وەردی نێژرابوو پیاوانی تاریکی لەم بیرمەندە گەورەیە خۆش نەبوون دوایی مردنیشی، تا ئێستا ڕیشەکانی کاریگەری هەیە لەسەریان وەك چۆن وەردی بەڵگەیەك بوو، لەسەر سەردەمە نەخۆشەکەی وڵاتەکەی.

# دانپێدانانەکانی علی وەردی

ئەم چارپێکەوتنەی عەلی وەردی لەیەکێك لە ماڵپەڕەکانی عێراقی یەوە وەرگیراوە،

عەلی وەردی بیرمەندێك و زانایەکی گەورەی دیارە، چالاکی هزری لە سیەکانی تەمەنیەوە دەستی پێ کردوە، کە پشت بەشیکاری دەبەستێت بۆ بنیادنانی کۆمەڵگەی عەرەبی بەشێوەیەکی گشتی و کۆمەڵگەی عێراقی بەشێوەیەکی تایبەتی. فەلسەفەکەی لەسەر ئاسان کردنە و بابەتیانەیە دەوەستێت، هەر لەمندالیەوە شەیدای زانستی کۆمەڵناسی بووە،

رادادەنێت زانستی کۆمەڵناسی ئاتێستاش نەیتوانیوە لە سروشتی مرۆڤ تێبگات لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی.

نوسینەکانی وەردی مشتومڕێکی زۆری وروژاندوە لەناوەندە رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی یەکاندا و ئەو نوسراوی دەرچووە گرنگ ترینیان کورتەیەکی کۆمەڵایەتی یە لە مێژووی عێراقی نوێ لە هەشت بەرگ دا، ئەم کتێبانە فرۆشتێکی جەماوەری زۆریان هەیە و هەندێکیان وەرگێردراونەتە سەر زمانەکانی(ئەڵمانی، ئیسپانی،

فارســـی و پۆلەنـــدی و هیتـــد) ئـــەو کەســـایەتیکی وروژێنـــەرە بـــۆ مشـتومڕ، ئەوەنـدە بەسـە کـە دوانـزە کتێـب دەرچـووە بـۆ وەلامدانـەوەی بیروبۆچـوونەکان و شـیکاریەکانی وەردی. ئەمـەش کـارێکی دەگمەنـە. کەســـایەتی یـــە ســـادەیەکەی و رۆحـــە گەنجانەکـــەی و (ابـــی الحیـــانی التوحیـــدی) مـــان بـــیر دەخاتـــەوە لەســـەردەمێك کـــە شارســـتانیەتی عـەرەبی لـەو پـەڕی گەشەسـەندندا بـووە. عـەلی وەردی خـەمی حـەفتاو پێنـج سـالەی خـۆی هـەلگرتووە، ئـەم گفتوگۆیـەی کـە پێش سـی سـاڵ لەمەوبـەر ئەنجامـداوە لەگـەلی دا. تیشـك دەخاتەسـەر بۆچـوونەکانی کۆچکردوو عەلی وەردی.

پرسیار: بۆ ماوەی دە ساڵ تۆ لە شانۆی فیکری دووریت زۆریش وتراوە لەبارەی ئەودوورە پەرێزیەتەوە .لەم کۆتایەش دا زانیومە خۆت دوورەپەرێزکردووە، بۆ نوسینی کتێبێکی نوێ لەبارەی سروشتی مرۆڤ، من ئەوەندە کە پیشەکەت و ئارامیەکەت لەسەر نوسین ناشناتم سەیرم لێ دێت کە کتێبە نوێ یەکەت ئەوەندە دووابکەوێت کە زۆرێك لە خوێنەرەکانت، بە تاسەوە چاوەڕێی بلاوبوونەوەی کتێبەکەتن ئایا دەکرێت هۆکارەکانی ئەم دواکەوتنەمان بۆ ڕوون بکەیتەوە؟

وەلام- ئایشارمەوە من زیاتر لە پێنج ساڵە خەریکی ئەم کتێبەم، لە بەر دوو هۆکار ئەم کتێبە دوا کەوتووە، یەکەمیان گەورەی تەمەنم و لاوازی تەندروستیمە بەشێوەیەك کە ناتوانم زیاتر لە کاتژمێرێك یان دوو کاتژمێر لە ڕۆژێك دا کار بکەم. بەلام هۆکاری دووەم قورسی بابەتەکەیە

شاراوە نی یە لات کە سروشتی مرۆڤ قورسترین بابەتی دەروونی کۆمەلایەتی یە ئەگەر لەهەموویان قورستر نەبێت، چونکە بابەتێکە هەتابلێیت ئالۆزە، لەڕاستی دا تا بچمە ناو لێکۆڵینەکەوە هەست دەکەم هێشتا لەسەرەتای ڕێگەکەم دا، هەرجارێك لەلایەنێکی تورێژینەوەکە دە کۆڵمەوە و لەو کاتەدا چەندین لایەنی دیکە دەردەکەونت کە پێویستیان بە لێکۆڵینەوە لەبارەی سروشتی مرۆی دا هەیە. چەندین گریمانە دەرکەوتووە هەروەك لەچەندین لێکۆڵینەوەی بێشومارەدا بلاوەکردوونەتەوە، و دان بەوەدا دەنێم کە هەست دەکەم بێ توانام لەبەرامبەر ئەم لێکۆڵینەوە و گریمانانەدا چونکە لەو پەڕی قورسی دان، مەحاڵە لە هەموو گریمانەکان و لێکۆڵینەوەکان تێبگەین. سەرەڕایی ئەوەش هەندێك لەو گریمانانە، لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی لێکۆڵەرەوەدا وەك یەك نیە. لێرەدا نازانێت لێکۆڵەر سود لە چ گریمانەیەك وەرگرێت، و چ گریمانەیەك پشتگوێ بخات. هەروەها پێویستە ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە ئەو زانستانەی لەسروشتی مرۆڤ دەکۆڵنەوە وەك زانستی دەروون ناسی و کۆمەڵناسی ئەوانە لەو زانستە زۆر نوێیانەن کە بەشێوەیەی میتۆدی و زانستی وەرنەگیراون، تەنها ماوەی سەدەیەك یان کەمێك زیاتر نەبێت ، دەتوانین بڵێین کە ئەم زانستەنوێ یانە لە بنیادناندان، لەبەرئەوە هەرچی گریمانەو لێکۆڵینەوەی ئەو زانستانە هەیە جیاوازن، یان ناکۆکن. بەپێی توانا هەوڵم داوە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو گریمانە جیاوازانە بکەم کە لەم بابەتەدان. بەلام توانام سنوورداره، هەروەها پەیوەندیم لەگەڵ ناوەندە

زانستیەکانی دەرەوە سنوورداره هەروەها ئەوەی پاڵی پێوەنام کە بەردەوامبم لەسەر لێکۆڵینەوەی سروشتی مرۆڤ بلاوبوونەوەی ئەو چەمکە هەڵانە بوو سەبارەت بەم سروشتە بوون. ئەو چەمکانەش لە ڕابردوودا بۆمان بەجێ ماون و زیانێکی زۆریان لێداوین لەبارەی دەروونی کۆمەڵایەتی یەوە، و تا ئێستاش زۆرێك لە ڕۆشنبیران و کەسانی نەخوێندەوار ئەو چەمکانە ئالووگۆڕ پێ دەکەن و کاریگەربوون بۆیان لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیان بەبێ ئەوەی بزانن چ هەڵەیەکی تێدایە یان کاریگەری ئەو زیانانە بزانن لە ئەنجام دا.

پرسیار: ئایا دەکرێت چەند چەمکێکی هەڵە و کەم وکورت پێشکەش بکەیت، لەکاتێك دا تۆ دەزانیت کە ئەوەی ئێمە لە باروودۆخێکی جیاوازدا ژیاوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەعەقڵیەتێکی جیاواز بژین بۆچوونی تۆ لەم بارەیەوە چی یە؟

وەلام: لێرەدا دەرفەت نی یە بۆ ژماردنی ئەو چەمکانە تەنها دوو نموونە دەهێنینەوە، یەکێك لەو چەمکانە ناوی دەنێن عەقلانیەت، مەبەستمان لەوەیە کە (مرۆڤ ئاژەڵێکی عاقڵە و بیرو هەڵسوکەوتی بەپێی عاقڵی وهۆشمەندی و لۆژیکی، ساغە. ئەگەر بمانەوێت مرۆڤێك قایل بکەین بە گۆڕینی بیروباوەڕەکەی، دەبێت بەڵگەی عەقڵی بهێنینەوە کە پێی قایل بێت تا بیروباوەڕەکەی بگۆڕێت، ئەگەر ئەوەی نەکرد ئەوا دیارە مرۆڤێکی ئێنکار یان توندڕەوە، لەم حاڵەتەدا دەبێت ئەو کەسە سزا

بدرێت، بەڵام چەمکی دووەمیان برێتی یە لەوپرەنسیپەی کە دەڵێت.( هەرکەس هەوڵبدات دەگات بە مەبەستی) بە واتایی ئەوەی هەموو مرۆڤێك دەتوانێت بگاتە ئەو ئاستەی سەرکەوتن کە مەبەستیەتی، ئەویش تەنها، بە هەوڵدان و خەباتکردن دەبێت، چونکە ڕێگە لەبەردەمی دا کراوەیە وەك ئەو پەندە باوەی کە دەڵێت:(هەرکەس بە ڕێگەیەك دا بڕوات دەگاتە جێ) هەرکەس هەوڵ بدات بەدەستی دەهێنێت. یان هەرکەس دارایی بەرزی بکات دیارە شەوغونی کێشاوە، یاخود ئازایەتی پیاوان شاخەکان دەلەرزێنن، ڕێگام پێ بدە جیاوازم لەگەڵت لەم دووبۆچوونەدا، عەقلانیەت تایبەتمەندیەکە کە مرۆڤی هۆشمەندی پێ جیا دەکرێتەوە، بەڵام، پرەنسیپی ئەوەی کە هەوڵ بدات دەگات بە مەبەستی، واتایی ئەوەیە کە لەسەر تاك پێویستە بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە لەچینی کرێکار یا خود ئەو کەسانەی کە بژێویان سنوورداره، پێویستە کار بکەن بۆ ئەوەی شوێنێکی بەرزیان هەبێت لە کۆمەڵگەدا، تا بگاتە ئاستێکی بەرز لە کۆمەڵگەدا، گەواهیدەریی زۆرمان هەیە کە ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە ڕۆڵەی هەژاران گەیشتوونەتە بەرزترین ئاست لە دەسەلات دا، ڕوانینی نوێ وادادەنێت کە عەقلی مرۆی لایەنداره بە سروشتی خۆی، عەقلی مرۆڤ سنوورداره، ئەم ڕوانینەش پێچەوانەی ڕوانینی فەلسەفەی کۆنە کە متمانەیەکی ڕەهای بە عەقڵ هەبوو، زیاد لە پێویست ڕێزی لە عەقڵ دەگرت. ئێمە نکۆڵی لەوەناکەین کە عەقڵ، ئامێرێکی گەورەیە کە

خودا بە مرۆڤی بەخشی وە، مرۆڤ لە ئاژەڵەکانی تر جیادەکاتەوە، بەڵام کە ئێمە دان بەوەدا دەنێین پێویستە ئەوەمان لە بیر نەچێت، کە عەقڵ سنورێکی دیاریی کراوی هەیە و لە چوارچێوەی ئەو سنوردارە، عەقڵ زۆر گەورەیە، بەڵام لەدەرەوەی ئەو سنورە عەقڵ هیچی پێ ناکرێت، ئەگەر دووکەس گفتووگۆیەك بکەن لەسەر رایەك، ئەوا زۆر دەگەمنە ئەو گفتوگۆیە کۆتایی پێ بێت، بەقایل بوونی یەکێك یان بەڵگەی ئەو کەسەیان، کە زۆر بەهێز و ئاشکرایە، بەروانینی ئەوی تریان. بەڵگەکانی بێ نرخ و نادیارن یان بەروانینی ئەویتریان بەڵگەکان قایلکەر نین، هەریەکەیان روانینێکی خۆی هەیە بۆ هەموو کاروبارەکان، لە رێی ئەو چوارچێوانە، کە هۆکارە نەستیەکان. دایان رشتوون بەدەوری بیرکردنەوەی دا، تۆ بەڵگەکەت، بەلایی خۆتەوە وەك خۆری رۆژی نیوەرۆ وایە، بەڵام نازانیت کە بەرامبەرەکەت کوێرە یا خود لە ژوورێکی تاریك دایە، یان چوار چێوە فکریەکەی وایی لێکردوە بڕوانێتە ئەو ناراستەیەی کە هیچ خۆری تێ دا نی یە لەو چوارچێوەش دا لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە ﴿انها لاتعمی الابصار ولکنها تعمی القلوب التی فی الصدور﴾ وتەیەکی تری خوای گەورە﴿ان اکثرهم لا یعقلون﴾

ئەبێت ئەوە بخەینە بەرچاومان کاتێك دەمانەوێت مامەڵە لەگەڵ خۆمان دا دەکەین هەوڵ بدەین خۆمان قایل بکەین بە بۆچوونێك لە

بۆچوونەکان، ئەو کەسەی کە مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دا دەکات، بە پێی ئەوەی ئەو کەسانە زۆر ژیرن، لەوانەیە لە ژیانی ڕۆژانەیان دا شکست بهێنێت، وە ئەم شکستە دەخاتە ئەستۆی خەڵکی کە لەبەرامبەری دا ئەنجامی دەدەن، بەڵام ئەو لە هەمووکەس زیاتر شایەنی سەرزەنشت کردنە.

پرسیار: تۆ دەڵێیت هۆکاری نەستی هەیە، کار دەکاتە سەر بیرکردنەوەی مرۆڤ بەشێوەیەك پێ یان نازانێت ئەو هۆکارانە کامانەن، وە چۆن هەریەکەیان کار دەکاتە سەر بیرکردنەوەی مرۆڤ؟

وەڵام: هۆکارە نەستی یە کاریگەرەکان، لەبیرکردنەوەی مرۆڤ دا زۆرن، باس لەمانەیان دەکەین.

- *کە لەپوورە بەجێماوەکان:* مەبەستم لەو کەلەپوورانەیە کە لە زاراوەی کۆمەڵناسی دا هاتووە، ئەو کۆمەڵە بیروباوەڕ و بەها و تەقالید و قسە باوانەی کە لە کۆمەڵ گەیەکی دیاری کراودا هەیە، کە کۆمەڵگەکانی دیکەی پێ جیا دەکرێتەوە، هەموو کۆمەڵگەیەکیش کەلەپورێکی تایبەتی بەخۆی هەیە، زانایی کۆمەڵناسی(سیمس) لە کتێبەکەی دا دابونەریتی کۆمەڵگاکان دەڵێت: دابورنەریتە میلیەکان دەتوانن هەمووشتێك بە ئاڕاستەی جوانی و باشە بەرن یان بە بەپێچەوانەوە بەرەو ئاڕاستەی خراپی بەرن. کە ئەمەش یەکێکە لە هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتی یەکان، بیەوێت تێکەڵی و مامەڵە لەگەڵ

خەڵكی دا بكات دەبێت بیانزانێت، لە (ئەسكیمۆنەكان) هوە دەگێڕنەوە كە لە جەمسەری باكوور نیشەجێن، یەكێك لە دابوونەریتە كەلەپوریەكەیان ئەوەیە(ئەگەر میوان بچێتە ماڵی یەكێكیانەوە ئەوا دەبێت، شەو لەگەڵ ژنەكەی دا بخەوێت) ئەمە ڕەوشێكی كۆمەڵایەتی ئەوانە كە تاكی لەسەری پەروەردە بووە هیچ كەموكورتی و شوورەیەكی تێ دا نی یە بەلام لە دیدی دەشتەكیەوە كارێكی بڕوا پێنەكراوە.

- *بەرژەوەندی تایبەتی و سۆز:* ئەگەر مرۆڤ بەرژەوەندیەكی تایبەتی لە كارێك دا هەبێت ئەوا عەقڵی بەلایی ئەو كارەدا دەچێت كەدەی زانێت، ئەمەیە كە تێبینی دەكەن بە شێوەیەكی ئاشكرا. لە هۆڵەكانی دادگادا، ئەو كەسەی كە كێشەیەكی خراوەتە بەردەم دادگا بیری چڕبووەتەوە لەدەرخستنی ئەو كێشەیە، لە پێناو ئەوەش دا هەموو بەڵگەیەك دەهێنێتەوە، بۆ پشتگیری داواكەی ئەگەر دادوەر بڕیارەكەی لەبەرژەوەندی خاوەن كێشەكەدا بێت، ئەوا بەدیدی ئەو، ئەو دادگایە بە دادپەروەرترین و پاكترین دادگا دادەنرێت لە جیهان دا، بەلام ئەگەر دادوەر بڕیارەكەی بە پێچەوانەوە بێت ئەوا ئەو دادوەرە بەخراپترین دادوەر دادەنێت، و دەتوانین لەبارەی سۆزەوە بڵێین هەروەك چۆن لەبارەی بەرژەوەندی تایبەتی یەوە دەڵێین كە كاریگەری بەسەر بیری مرۆڤەوە، بەشێوەی سپی بەڕەش دەبینێت و ڕەشیش بە سپی دەبینێت. مرۆڤ ئەو كەسەی خۆش دەوێت كە یارمەتی

دەدات و باشە لەگەڵی دا، بەڵام نایبینێت، ئەگەر کێ بەرگێی لەگەڵدا بکات، لە پیشەیەك دا یان لە پایەیەکی کۆمەڵایەتی دا، واتە بەشێوەیەك ڕوانینی لە باشەوە دەگۆڕێت بۆ ڕوانینێکی ڕق لێبوونەوەوە، وەکاتێك باشەکانی بۆ خراپە دەگۆڕێن، لەکاتێك دا کە پێشتر کەموکورتیەکانی گۆڕابوون بۆ باشە، ئیمامی شافعی لە دێرە شیعرێکی بەناوبانگی دا دەڵێت:

*چاوی ڕازیبوون لە هەموو کەموو کورتیەك چاوپۆشی دەکات*

*هەروەك چاوی تووڕەی کــــــەموو کورتیەکـــان دەخـــاتە ڕوو*

– *ئــەزموونی بـیرو و بۆچـوونەکان و هەنووکەیـەکان:* مــرۆڤ بــە ئــەزموونێکی تراژیــدی یــا خــود خــۆش تــێ دەپــەڕێت بەرامبــەر بــەکارێك لــە کارەکــان کــەوا ئــەو ڕووداوەبیر دەچێتەوە بــەڵام، یــادەوەری لــە نەســتی دا بــە شــارەوەی دەمێنێتــەوە، وە ئەگــەر کەســێك یــاخود شــتێکی بینــی ئــەو ڕوداوەی بــیر دەخاتــەوە، ئــەوا هەســت بــە تــووڕەی یاخود هەســت بەخۆشــی دەکــات، بۆیــە زۆرجــار ئەمــە کــار دەکاتــە ســەر بیرکردنــەوەی مــرۆڤ بەرامبــەر بــە ڕاوبۆچــوون و ئاراســتە ڕۆشــنبیریە ســیاســیەکان، بــەڵام ئــەزموونی هەنوکــەیی، هەســتکردنی مرۆڤــە بــە بــە بــوونی خــۆی، یــان خــود هەســتکردنە بــە ئــەوی دی،( مــن) ڕووی بــەرەی کەســیەتی، هــەموو مرۆڤێــك هەمیشــە هــەوڵ دەدات، بــۆ

بەرزکردنـەوەی پێگـەی(مـن)واتـە(الانـا) لـە دیـدی کۆمەڵگەکەیـەوە ، مرۆڤ زۆرجار بەرژەوەندی پێشێل دەکات، لە پێناوی(من)دا.

تۆ دەتوانیت مرۆڤ بکەیتە هاوەڵێکی دڵسۆزت، ئەگەر ڕێزت هەبوو بۆی هەروەك چۆن دەتوانێ بیکەیتە دوژمنی خۆت ئەگەر ڕقت لێی بوو یاخوود سووکایەتی پێ بکەیت، زانیاریش ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. مرۆڤ هەندێك کات بە درۆ دەخاتەوە یا خود باوەڕیان پێ دەکات ئەو زانیاریانەی کە هەیەتی لەبواری کارەکەیەوە، نەخوێندەوارێك بە نموونە وەرگرن کە لە لادێ یەکی دوورە دەست دا دەژی. ئەو زەویی بە تەختی دەبینێت و خۆریش بە دەوری دا دەسوڕێتەوە، مەحاڵە قایلی بکەیت بە پێچەوانە بێت، ئەو بە شێت و نەزانت دەزانێت چونکە بەدیدی ئەو نکۆڵی لە ڕاستی یەك لە ڕاستیەکانی عەقڵی دەکەیت کە نابێت گومانی هەبێت پێی، ئەمەش تەنیا بەسەر نەخوێندەوارێکی سەردەتای دا جێبەجێ نابێت، بەڵك و هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە، تەنانەت زانایانیش ئەگەر بەچاوێکی ڕێژەی سەیرمان کردن زۆر لە زانایانی سەدەی ڕابروو دەبینین کە هەندێك لە کارەکانیان بە مەحاڵ زانیوە، دواتر لەم سەردەمەدا ئەو کارانە ڕوون بوونەتەوە،

- *زیرەکی و شێتی:* زیرەکی، زیرەکی بەپلەی جیاوازە لەنێوان کەسەکان دا، هەروەك چۆن ئاشکرایە کە کەسانێکی سەرکەوتووهەن بەهۆی زیرەکیەکەیانەوە، دواکەوتوشمان هەیەلە زیرەکی دا وەك چۆن

کەسانی هاوشاوەندیشمان هەیە. پێویست ناکات بلێین کە زیرەك لە کاروبارەکان دەگات بەشێوەیەکی جیاواز لە گەمژە. زۆرجار ئەو کەسەی سەرکەوتووە لە زیرەکی دا، هەست دەکات لەخەڵکەوە نزیکە و ناتوانێت کەسانی دیکە بەڕاستی قایل بکات و کێشەی خەڵکی دێنێت بەسەر خۆی دا، بەهۆی جیاواز بوونی بیرکردنەوەکانی لە خەڵکی خەڵکان ڕقیان لێی دەبێت، یا خود ئەوەی دەوترێت لەبارەی پلەکانی زیرەکی یەوە، لەبارەی پلەکانی شێتی یەوە دەوترێت. (خەڵکی هەموویان شێتن بەلام جیاوازیان لە پلەکانی شێتی دا هەیە). ئەو کەسەی کە زۆر شێتی تێدا هەیە لاوازە، خەڵك دەتوانێت تووڕەیی خۆی دەستەمۆ بکات و دەستی بەسەردا بگرێت بەلام ئەو کەسانەی کە ئێمە، بە ناقڵیان دادەنێن لەڕاستی دا ئەمانە عاقڵی تەواو نین بەڵك و هەریەکەیان کەم وکورتیەك لە عەقڵیان دا هەیە کە وایی لێدەکات بەجیاوازی لە کاروبارەکان بگات لە خەڵکانی دیکە.

- *من و منێتی.*

پرسیار: ئێمە دەزانین کە گریمانەی نوێ بۆ لێکۆڵینەوەی سروشتی مرۆڤ وادادەنێت کە (من) بەرەی کەسیەتی مرۆڤە. لەم حاڵەتەدا چۆن شیکاری جیاوازی دەکەین لەنێوان من و خۆپەرستی دا؟

وەلام: منیەتی وەك خۆ پەرستی وایە، دەدرێتە پاڵ (من). بەلام جیاوازیەك لە واتاکەی دا هەیە لەنێوانیان دا ئەو واتایەی کە لەنێوان خەڵکی دا ناڵوگۆڕی پێ دەکرێت. لەبارەی خۆپەرستی یەوە ئەوەیە کە وا

لە مرۆڤ دەکات کە بایەخ بە بەرژەوەندی خۆی بدات گرنگی بە بەرژەوەندی کەسانی دیکە نەدات، بەلام(منیەتی) واتایەکی دیکە دەدات، واتای ئەوەیە کە هەست کردن بە خودی مرۆڤ یاخود(من) بەرامبەر بەخەلکی ئەو هەستە وا لەمرۆڤ دەکات کە لەبەرزکردنەوەی پێگەی (من) دا بێت لە دیدی کۆمەلگەکەیەوە.

پرسیار: مەبەست چی یە لەو قسەیەی کە (من)بەرەو کەسیەتی مرۆڤە، ئەمە واتایی ئەوەیە کە ئێمە ئێرگزیەتمان هەیە بەرامبەر بە سروشت؟ئایا(من )ی تاك لە ئەندامانی کۆمەلگەوە بەدەستی دەهێنێت یان ئەو(من)ە هەر لەمندالی یەوە لەگەلی دا ئەشونما دەکات وە ئایا (من)یەتی لە کۆن دا ناسراوبووە.

وەلام: مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی بیرکردنەوەکانی لەدەوری (من)دا چڕ دەکاتەوە، وە چۆن خەلکی بۆی دەڕوانن و هەست بەگەورەی ڕێز دەکات، کاتێك خەلکی ڕێزی لێدەگرن و پێی سەرسام دەبن . هەروەك و چۆن پێی بێزارن هەروەك کاتێك ڕقیان لێی دەبێتەوە ئەوا بەسوك سەیری دەکەن و پشتگوێی دەخەن. ڕاستە ئەگەر بلێین زۆربەی چالاکیەکانی مرۆڤ لە ژیانی دا بەدەوری ئەم خالەدا دەسوڕێتەوە کە هەمیشە هەول دەدات جێگەی ڕێزبێت نەك جێگەی سەرزەنشت و لۆمە بێت، پەندێکی دەشتەکی هەیە دەلێت:(بسوتێی باشترە لەوەی کە عەیب

و عارت بەسەردابێت) تاوەك ئێستاش ئەم پەندە باوە و كاریگەرێكی زۆری هەیە لە كۆمەڵگەی دەشتەكی دا، واتاكەی ئەوەیە كە دەشتەكی حەز دەكات بیچێتە ناو ئاگر لە ڕۆژی دوای دا نەك شورەی بێت بەسەری دا لەدونیادا...

(منیەتی) لەمرۆڤ دا هەر لەسەرەتای منداڵی یەوە دەردەكەوێت، نیشانەكانی دەركەوتنی لە منداڵی دا ئەوەیە كە خۆشحاڵی تێ دا دەردەكەوێت كاتێك ستایشی دەكەیت، هەروەك چۆن تورە دەبێت كاتێك سەرزەنشتی دەكەیت . ئێمە دەتوانین وا لەمنداڵ بكەین هەموو كارێك بكات كە داوای لێ بكەین تەنها بە ستایشكردن و هاندانی. ئەوەی جێگەی تێبینی یە منداڵ زۆر هەستیارە بەرامبەر بە منداڵانی هاوشێوەی خۆی، لەوانە نەتوانین ستایشی منداڵێك بكەین بە ئامادەبوونی یاخود لەگەڵی دا پێبكەنین. پشتگوێ خستنی (من) یەتی لە منداڵ دا، زۆرجار دەبێتە هۆی دروستبوونی گرێی دەروونی، لەلایی خەڵكان لە كۆمەڵگەی ئێمەدا ڕاهاتوون لەگەڵ منداڵانی بچوك لەبەردەم منداڵانی گەورەتر لە خۆی، ئێمە نازانین ڕێژەی ئەو ئازارە قوڵەی كە منداڵ هەستی پێ دەكات لەئەنجامی ئەوكاری كردنەدا. زۆرجار ئەندامانی خێزان دڵخۆش دەبن بە لەدایك بوونی منداڵێكی نوێ لە دەوری كۆدەبنەوە و پێدەكەنن بە ئامادەبوونی براكانی تری كە لەو گەورەترن، ئەو كاریگەریە خراپە پشتگوێ دەخەن كە لەناو دەرونیان دا ڕوودەدات، لەكاتێك دا

منداڵەکانی تر هەست بە (ئیرەیی) دەکەن، لە وانەیە هەڵێك بقۆزنەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە منداڵەکە بەبێ ئەوەی مەبەستیان بێت یا خود هەستی پێ بکەن، منداڵانی ئێمە لە کۆڵانەکان دا یاری دەکەن، کە(من)یەتیان نەشونما دەکات لەسەر بنچینەی شانازیکردن بە بەباهاکانی کۆڵان لەسەر کەوتن و دەستدرێژیکردن و دزی کردن، ئەمەش هۆکارێکە لە هۆکارەکانی نەشوونماکردنی(دووفاقیەتی کەسیەتی) لەمەندێکیان دا، بەلام، (نیرگزیەت) بریتی یە لە خۆشەویستی خود و شتێکی دیکە!

پرسیار: پارێزەرانی زمانی عەرەبی و بانگەشەکەرانی بۆ بەکارهێنانی بەشێوەیەکی بەردەوام تۆمەتبارت دەکەن، بەلاوازی شێواز و کەمی ڕەچاوکردنی ڕێزمان بەتایبەتی لە(نحو) و دارشتن دا. ئاشکرایە کە تۆ شارێکی (ئاین)یت دروستکردوە و قوتابخانەی تەقلیدی تێدایە، لە زانستە جۆربەجۆرەکان دەکۆڵنەوە وەك( **نحو والصرف اللغة العربية**).

بۆچی دوور کەوتوویتەوە و ناکۆك بووی؟ بیرورایی تۆ لەبارەی زمانەوە چی؟

وەلام: زمان، بەچەمکە شارستانی یەتە نوێکەی، هۆکارێکە بۆ ئامانجی زیادەڕەوی ئەگەر بڵێین ئەو کەسانە هەوڵ دەدەن بۆ پیرۆزکردنی زمانەکەیان و هێشتنەوەی وەك شێوازە کۆنەکەی، ئەوانە زیان بەنەتەوەکەیان دەگەیەنن، بەشێوەیەك کە بێ ئاگان لەو زیانە، کەسێکی

شارەزا لە (نحو) دا پێی وتم، سێ یەکی رێزمانی(نحو) کە لەقوتابخانەکانمان دا دەخوێنرێت دەکرێت هەڵبوەشێنرێتەوە، نابێتە هۆی هیچ زیانێکیش، عەرەبە پێشینەکان هیچ شارەزایان نەبوو لەم رێزمانە ئاڵۆزەیان لە ووتەی رۆژانەیان دا، بەکاریان نەدەهێنا، ئەم رێزمانە سروشتی و گونجاونی یە، ئەوان شارەزایان هەبووایە لە رێزمان دا، لە کاتێك دا ئەم زمانەیان بەسروشتی خۆیان قسەیان پێ دەکرد بە بێ دەستکارکردنی زمان.

دەتوانین رێزمانی(نحو) بچوێنین بە رێزمانی(الفقه)کە فەقێ کان گەشەیان پێ داوە. ئێمە دەزانین کە پێغەمبەر(د خ) چەند زانیاریەکی کەمی داوە لە بارەی(تارەت گرتن)یاخود(پاکوخاوێنی) و دەست نوێژ و رۆژ و حەج کردن، بەلاّم فەقێکان هاتن ئەم بیروبۆچوونانەیان گەشە پێ دا بەشێوازێك زۆر قورسە کە مرۆڤ بتوانێت بەوردی جێ بەجێ یان بکات، ئەوەی بیەوێت شوێن ئەم بۆچونانە بکەوێت توشی دڵەراوکێ دەبێت، ئەوەی کتێبە گەورەکان بخوێنێتەوە کە فەقێیەکان نوسیویانەتەوە لەبارەی پاك وخاوێنی یەوە، تەنها ئەم بابەتە وەك دەریایەکی بێ بن وایە، ئەمە بوو (شێخ عەبدە لە میسر و سەید موحسن الامین) لە شام، دژی ئەم بیروبۆچنانە وەستانەوە.

هەمیشە بانگەشەم کردووە، بۆ پێویستی کەم کردنەوەی ڕێزمانی(النحو) لە زمانەکەمان دا بەلاّم لە ئاسانکردنی ئەم بوارەدا زۆرم نالاّندوە.

ئێستاش لە کۆتایی تەمەنم دا گوێ نادەمە ئەوەی چی دەڵێن. ئەوەی کە سەبووری دامەوە لەم بارەیەوە، وتەیەکی خوایی گەورەیە کە دەفەرمێت:(فاما الزبد فيذهب جفاءً ومايـنفع الناس فيمكث فى الارض).

# عەلی وەردی... دەنگێکی ڕاستەقینە بیرمەندێکە پرسیاری ناساند بە دەسەڵات ونایین!!

لەساڵی 1958 بەسەردانێك بۆلای ئیمام موحسین.(وەردی) پرسیاری دەکرد لە (مجتهد)ی گەورە بۆ هاوڕێیەتی کردنی محمد سعید ئەلحەبوبی لە جەنگی جەماوەری دا لە بەسرە دوایی جەنگی یەکەم، (وەردی) پرسیاری لێ دەکرد و ئەویش خۆی لێ دەرباز دەکرد تا کاتژمێری دیاریکراوی تەواوبوو لە وگفتوگۆیەوە محمدسعیدی ناسی.(وەردی) پرسیارکەر بوو نە ڕوونکەرەوە، پرسیاروو ڕوونکردنەوەی گۆڕی هەروەك پێی وتم ئایاپرسیارو رونکردنەوە چین؟ گوتم: پرسیار هێزەو ڕوونکردنەوە لاوازە، لە پرسیاردا یادەوەری دەبزوێنێت و شتە شاراوەکان دەکەونە بەردەست، بەلام لەڕونکردنەوەدا تۆ قوتابیت نەك ماموستا.

گوتم ماموستا تۆ مێژوو نوس نیت، دوایی ئەوە زانیم کە وەردی کتێبەکانی دادەنێت لەڕێگەی پرسیارکردنەوە کە ناوەرۆکەکان

دەجولێنێت، (سوکرات) سامانە ووتەیەکەی لە کۆمەڵە پرسیارێکەوە وەرگرت کەئاراستەی قوتابیەکانی دەکرت.
(وەردی)ش بەهەمان شێوازی (سوکرات) هاتە ناوەمەیدانەوە ودەستی کرد بەپرسیارکردن لە خەڵکی کرد سەبارەت بەئەو ڕوداوانەی کە لەسەردەمیانەوە ڕووی داوە. ئەگەر گومانی لە وەلامی پرسیارێك هەبوایە بەشێوازێکی تر پرسیارەکەی دووبارە دەکردەوەو گومانەکەی دەڕەوییەوە. سێ یەکی نوسینەکانی وەردی لەم شێوازەن گومان و پرسیار و جولانەوەی هەناوی ناوەوە، سروشتی عێراقی وەلامی شتی گرنگ ناداتەوە ئەگەر یادەوەریەکانی نەبزوێنی . زانستی کۆمەلایەتی کە وەردی تایبەتمەندبوو تێی دا هەر لەسەرەتایی دامەزراندنی یەوە، دوای گۆڕینی شێوازەکانی پرسیار گومانی لەهەموو وەلامێك دا دەکرد. بەبێ لایەنی لەنیشاندانی وەلامەکان، بەلام ڕۆلی وەردی بەشێوازێك بوو کە شێوازی هەموو بیرمەندەکان بوو، ڕووداوەکان دەخوێنێتەوە، دەیخاتە ژێر تاقیکردنەوەوە و دواتریش لە عەقلی دا هاوسەنگی دەکات و پەیوەستی دەکات بەڕووداوێکی کۆنتر. دواتر دەرەنجام دەدات هەروەك ئەو نەبێت، بەلکو بیری هەروەك تاقیکردنەوەی کۆمەلایەتی بێت و مەبەستیشی لەمەدا(گێڕانەوەی چیرۆکێکی نوێگەریە یا خود دەستپێ کردنی چیرۆکێکی نوێ یە)بەلام پەسەندکردنی لە نێوان پلان دانان و دەست پێ کردن خوێنەر بەگشتی حەزی بەبێ لایەنی یە، لە شێوازی وەردی دا چونکە ئازادیەکی پێ دەبەخشێت، لە گەشتی خوێندنەوەی ڕۆژانەدا

بیرمەندێکی وەك (وەردی) دەبێت بەشێوازێکی رەوانبێژی بنوسێت چونکە بۆ هەموو چینەکانە، ناوەڕۆکی نوسینەکانی بەهێز بوو بەڵام بەشێوازێکی ئاسان دەریدەبڕی، وەردی فەرهەنگێکی تایبەتی بەخۆی دانا، بەناوی فەرهەنگی زانستی کۆمەلایەتی. هەموو خەلکی دەیانخوێندەوە، وەردی هات خوێندنی گشتی دامەزراند لەسەر ئەم بنچینانە.

1- سادەیی — ئەو نەیوت من داهێنەری گریمانەیەکی تایبەتیم بە زانستی کۆمەڵناسی بەڵکو ووتی ئەمە شتەکی منە ئەگەر خوێنتەوە، بەڵام ڕاستر ئەوەیە کە وەردی هەوڵی دەدا ڕواڵەتەکانی کۆمەڵگەی عێراقی ڕونبکاتەوە لە بەر ڕۆشنایی سێ گریمانە کە هی خۆی نی یە ئەوانیش(دووفاقیەتی کەسیەتی) کە لە(ماکایفەر) ەوە وەریگرتووە. ململانێی دەشتەکی وشارستانیەتی یە کە لە(ابن خلدون) ەوە وەریگرتوە. سێ یەمیان ناسازی کۆمەلایەتی یە کەلە(ئوك بێرن)ەوە وەرگیراوە. وەردی ئەم گریمانانەی هەڵنەوەشاندەوە لە شیکارکردنی کۆمەڵگەی عێراقی بەڵکوهەوڵی دا دووبارە دایانڕێژێتەوە بەشێوازێك کە لە گەڵ سروشتی عێراقی دا بگونجێت..

2- دیموکراتی، دیموکراتی یەکێك بوو لە تایبەتمەندیەکانی بیرکردنەوەی کە لێی دانەبڕا تاکاتی مردنی، هیچ نوسەرێکم لە عێراق دا نەبینیوە ئەوەندەی وەردی دیموکراسیەتی پێ قبوڵ بێت.

3-(الجدل) مشتومڕی – عەقڵی جوڵەیەکی بزوێنەری هەبوو، ئەمەش کاردانەوەیەك بوو لەسەر بیرکردنەوەی، دواتر کاری کردبووبە سەر نوسنیەکانی هەستت بە مشتومڕدەکرد لە هەمووکتێبەکانی دا، خێرا نەبوو لە بڕیارەکانی دا، وەلامی ڕکەبەرەکانی دەدایەوە بە عەقڵ یاخود بە ڕۆحێکی لێکۆڵەرەوەیی هەوڵدەر بۆ ئاشکراکردنی ڕاستی، لە سەر داروپەردوی ڕاستی دا و توڕە نەبوو لە ڕەخنەی خۆبەزل زانێك، گفتوگۆی دەکرد لەگەڵ هەمووکەسێکی نەناسراو یان هەر ناوێکی خوازراو تانەت قوتابیەکانی کە وانەی پێ دەوتنەوە، لەسەرەتای گفتوگۆکانی دا پێی دەوتن(قوتابی و ماموستا نێوەندێکە بۆ ڕێزگرتن لە واتایی گفتوگۆکردن و دەوڵەمەندکردنی عەقڵ وبیرکردنەوە). لەهەموو ئەمانەش دا خۆی سادە پیشان دەدا بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکات و فراوانی بکات ، فراوانکردنی ئەم گفتوگۆیەش سەلماندنی کە زانای کۆمەڵناسی دەبێت دیموکرات خواز بێت، خۆشیەکانی دونیا عەلی وەردیان نەبرد بەشوێن خۆی دا، بەوە رازی هێنا کە ئەوەکان فێربکات لە زانکۆ بۆ ماوەی سەدەیەك دەرچاند و بوونە پسپۆڕ، ئەوەیەکی تری والێکرد کە ڕێگەی ئازادی و نیشتمان پەروەری بگرنە بەر وەك ئەوەی بە عەقڵ بەئەوەکانی بڵێت، (زانست- ئازادی – نیشتیمان، ئەمانە کۆڵەکەی کەسیەتی عێراقین کە دەچنە ناو دوارۆژەوە)، ئەگەر وەردی لە پەنجەرەی پەرلەمانی عێراقی دا دابنیشتایەو ئەو هاتوهاوارەی پەرلەمانی تۆماربکردایە، بەوتەی خۆیەوە بلاوی بکردنایەتەوە، لە ڕۆژی دواتردا نوری سەعید

دەهات بۆلای و بەگاڵتەوە پێی دەووت(ئەم شۆردنەوەیە بۆچی؟) وەردی پێدەکەنی و دەیوت: نەتەوەکەم شۆردنی خۆش دەوێت . لە کۆتای گفتوگۆکەی دانوری سەعید داوایی لە وەردی دەکرد پۆستی وەزارەتێك وەرگرێت و واز لەم هەرچی و پەرچیەتی یە بهێنێت، وەردی وەلامی دەدایەوە و دەی ووت،( پاشا، نوسین لەگەڵ فەرمانبەریەتی دا ناگونجێت.) نووسین بەشمشێرێکی تیژدەمێنێتەوە لە تاقەکانی مێژوودا ، دەمێنێتەوە بەدرووستکردنی مێژوو بەئازادی شمشێرەکەی لەو رۆژەی کە وەردی لە کازمیە لە دایك بوو لە ساڵی 1913 وە تا کۆتایی تەمەنی 1995 کاتێك ماستەرەکەی تەواوکرد لەساڵی 1948 دکتۆراکەی وەرگرت لە ساڵی 1950 لە تەکساسی ئەمریکی سەرۆکی زانکۆی تەکساس لە کاتی پێشکەشکردنی بڕوانامەکەی دا پێی ووت (ئەی دکتۆر وەردی تۆ دەبیتە دوارۆژی زانستی کۆمەڵناسی)، وە بەردەوام دەینوسی بەبێ ئاوەڕدانەوە بۆ دوارۆژ ئەگەر ئاوڕی بدایەتەوە ئەوا شکستی دەهێنا و و خۆی ماندوو دەکرد و هەوڵیدەدا، تەنها لەم ماندووبونەیدا دوا ڕۆژی خۆی بەدەستی خۆی درووست دەکرد، لە ساڵی 1950 (کتێبی کەسیەتی تاکی عێراقی - واعیزەکانی سوڵتان - گاڵتەجاڕییەکانی عەقڵی مرۆڤ - ئەفسانەکانی ئەدەبە بالاکان) و چەندکتێبێکی دیکەش، دواتر چەند بەشێك بەناونیشانی(کورتەی کۆمەلایەتی) نووسی، وە بڕوانامەی دکتۆراکەی، بلاوبوویەوە، لە ئەمریکا لە ساڵی 1981 تا ئێستاش

خانەی بلاوکردنەوەی عەرەبی و بیانیەکان کتێبەکانی بلاو دەکەنەوە، تا ئێستاش خەلکی. سەری ڕێز و نەوازشی بۆ دادەنوێنن.

هەروەك چۆن باوباپیرە بەناوبانگە عەلەویەکانی، لە کەرخ، لە بەغداد کە بە.(ئالی ابی وەردی)ناسراون تیماری برینی هەژار و زولم لێ کراوەکانیان دەکرد.نوسینەکانی وەك کۆمەلگەی مەدەنی، بیرکردنەوە لە گەشتێکی مەعریفی...عەلی وەردی و زانستی کۆمەلناسی.

"فالح عەبدول جەبار"

نوسین لەسەر عەلی وەردی چێژێکی تایبەتی هەیە. لە هەمان کات دا نوسینە لەسەر کۆمەلگە و کەسی تاك، وەردی لە دایك بوو لە کاتی دامەزراندنی عێراقی نوێ و کۆچی دوایی کرد لە کاتی دامەزراندنی دەولەتی کۆماردا، مێژووی کەسێتی وەردی، بە واتایەك لە واتاکان یانی مێژووی عێراقی نوێ بەلام دەرەئەنجامە فکریەکانی، بەشێکی جەوهەرین، لە گۆڕان کاریەکانی ئەو سەردەمە. لێکۆلینەوە لە نوسینەکانی ئەو سەردەمە هەر لە واعیزەکانی سولتان رە کورتەیەك لە مێژوی کۆمەلایەتی عێراقی نوێ بەرگی شەشەم گەشتێکی فیکری پێك دەهێنن، ئەم لێکۆلینەوەیەش بیرکردنەوەیە لەزانستی کۆمەلناسی. یان هەندێك لە لایەنەکانی ئەو زانستە، هەروەها بیرکردنەوەی عەلی وەردییە لەم زانستە، لە مێژوی بیری وەردی دا جۆرەها سەرچاوە و هاندەر دەبینم، بۆ بیرکردنەوە، کە کورتیان دەکەمەوە بۆ مەبەستی چڕکردنەوەی بیرکردنەوەلەسەریان و هیچی تر.

پەیوەندی نێوان زانایی کۆمەڵناسی و زانستی کۆمەڵناسی، بەتایبەتی دەدەین لە دەرگایی گریمانە و میتۆدەکانی زانستی کۆمەڵناسی بەلام گریمانەی وەردی (خلدون)یە. ئەم گریمانەیە وەك ڕەگەزێکی لاوەکیە سەرەڕایی پێگە سەرەکی یەکەی لە بیرو دەرەئەنجامەکان دا، هۆکاری ئەوەی کە لەم بارەیەوە نوسینومە لێکۆڵینەوەیەکی کورتی سەربەخۆم کردوە کە لەسەر شیکاری بەراوردکاری وەستاوە، لەنێوان ابن خلدون و وردی دا. کەواتە لێکۆڵینەوەی ئێستا چڕبووتەوە لەسەر وەردی.

کە ئەویش هەوڵێکە، بۆ شیکارکردنی سەرچاوە میتۆدیەکەی وەردی، کە وایان دەبینم تێکەڵەیەکە، لە دژی یەك، کە شێوازێکی تایبەتی هەیە، بۆ پێش بینی کردنی هەر نادیارێك، دەڵێم کە دژ یەکەکانی (فکر)وبیرکردنەوە، بەچەمك و جێ بەجێ کردنەوە بەڵگەی دەرەئەنجامێکی (فکر)یە بە بۆچوونی من. هەروەها تێکەڵەی سروشتی هەڵ هێنانە، بەڵگەیەکی تایبەتی زیندووە. چونکە تەنها گریمانەیەك نی یە لەهەموو لایەنە پێك داچووەکان بکۆڵێتەوە، بەلام لێکۆڵینەوە لە (فکر) بەبێ دژ یەك و میتۆدی پێتاندن ڕێگەی خۆی نادۆزێتەوە. بێجگە لەزیلدانی مێژوو نەبێت، ئەو دژیەکیانە لە میتۆدی وەردی دا چین؟ هەڵ هێنانە تێکەڵە سروشتیەکان چین کە وەردی پشتیان پێ دەبەستێت؟؟ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارانە بەم شێوەیە.

یەکەم: بەتەنها سەرگەرم بوونی وەردی بەزانستی کۆمەڵناسی یەوە وەك خاڵی دەرچوون وایە، کە ڕاشکاوانە بوو لەگەڵ ئەو بارودۆخە کۆمەلایەتی

یە کە تێی دابوو. ئەگەر بڕوامان کرد بە ووتەی (ئۆگۆست کۆنت 1789-1858 کە زانستی کۆمەڵناسی ئەم لقە نوێ یەی مەعریفی یە)، کە بەش داربوو لە دامەزراندنی داو ئەم زانستەش دەرنەکەوت. تا دوایی گواستنەوەی مرۆڤ لە قۆناغی (لاهووت)یەوە بۆ قۆناغی میتافیزیکی. تا لە کۆتای دا بگاتە قۆناغ و(دۆخی) لێکۆڵینەوەی ڕەها بۆ ڕاستی یەکان بەرامبەر بەهەست یان فەلسەفەی سەردەمی پیشەسازی، شارە گەورەکان، زانستە نوێیەکان، دەوڵەتە مەرکەزیەکان. دەرکەوتنی عەلی وەردی، وەك زانایەکی کۆمەڵناسی لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو لە عێراق دا لە شوێنێکی دواکەوتوو لە جیهانێك دا دەژی کە لە پێش قۆناغی دا دژەیەکی دەنوێنێت لە ناساندنی دا.

دووەم: بە پشت بەستن بەوەی کە پێشکەش کراوە، وەردی لە دایك بووە لە سەردەمێکی ناجێگیر، کە تێی دا کۆمەڵگەی کشتوکاڵی بەش بوو بوو لەنێوان هۆز و مەزهەب دا، وە ئەم بەش بوونەش هەڵ دەوەشایەوە کە دەگوازرایەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی نوێ کە تێکەڵ دەبوو لەگەڵ نەتەوە و دەوڵەت دا. وەردی لە سەردەمێك دا لەدایك بوو، چەکە کۆنەکان هەڵ دەوەشانەوە، لەجێگەی ئەمانە پیشە و پیشەسازی گەورە دروست بوون. لەئەنجام دا خانەدان و شێخەکان و چینی نوێ دەردەکەوتن. ئەو بارودۆخە ناجێگیرە، لەوپاش ماوە هەستیارانە دروست بوون، بۆ زانستی دینامیکیەتی گۆڕان، سەرەڕایی بوونی حەزێکی دژ بەو گۆڕانە لەلایی وەردی، بەشێوەیەکی نەستی، بۆقایل بوون بەبێ دەنگی یاخود جێگیری

کۆمەلایەتی وتیەك هەیە کە دەڵێت:(سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی جێگیرە) بەواتای سروشتی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی.

سێیەم: - کاتێك وەردی سێ کێشەی بنەرەتی کۆمەڵگەی عێراقی دیاری دەکرد، ململانێی دەشتەکی وشارستانیەتی ودووفاقیەتی کەسیەتی، و هەڵوەشاندنەوەی هۆشمەندی و کۆمەڵ)بۆ چارەسەرکردنی ئەم لایەنانە پشت بەمانەی خوارەوە دەبەستێت.

أ- گریمانەی (ابن خلدون)ی ڕاڤە کردوە، لەسەر بنەمایی میتۆدی ئەزموونی (بیکۆن- کۆنت).

ب- قوتابخانـــەی کۆمەڵناســـی ئـــەمریکی(جـــۆرج هێربێـــرت میـــد). (1931-18931) دامەزرێنـــەری قوتابخانـــەی(خـــستنەگەڕی هێمایی)(symbol inteaerction())لە کۆمەڵگە بچوکەکان دا.

ج- قوتابخانەی مێژووی ئەڵمانی (کارل منهایم و فەردینان کۆن)، بابەتی دیکەی هەیە کە وەرگیراوە لە زانستی کۆمەڵناسی، لە لایەن قوتابخانەی ئەمریکی ڕاڤە دەکرێت.

4- سەرەڕایی دووبارەکردنەوەی (وەردی) کە پشت دەبەستێت بە (ابن خەلدون)، خوێندنەوەی عەلی وەردی بۆ ئەو دووبارە گریمانەکەی ابن خلدون بنیاد دەنێتەوە، واتە گریمانەکە جارێکی دیکە ناوەڕۆردەکاتەوە، ململانێی نێوان دەشتەکی و شارستانیەت لەلای ابن خلدون لە دوو شێوازی دژ بەیەك دان، لە ڕێکخستنی کۆمەلایەتی دا، شارستانیەت و

دەشتەکی، کاریگەربوون لەسەر یەکتر، بەلاّم ئەم ململانێی دەشتەکی و شارستانیەت لەلایەن وەردی بریتی یەلە:

1- تێکەلّ بوونی بەعاکان لە شار.

2- چوارچێوەی ململانێی دەولّەتی نوێ.

ئەمە بەرهەمی شارستانیەتی عێراقە لە گەلّ تێکەلّ بوونی دەوروبەرە دەشتەکیەکەی دا، دوورگەی عەرەبی و ململانێی عێراق و شارستانیەتی هاتووی رۆژئاوایە، لە ئەنجامی داگیرکردنی عێراق لە جەنگی جیهانی یەکەم دا، بەلاّم گرنگترین کار بۆ تاوەژووکردنەوەی ابن خەلدون تاوەژووکردنەوەیەکی پێویستە، لۆژیکی ابن خەلدون هەروەك وەردی دەبینێت جیایە لە لۆژیکی ئەرستۆ، لە میتافیزکی یا خود لە ڕەوانبێژی جەوهەرە جێگیرەکان دا، لێرەدا ابن خەلدون دەخوێنێتەوە یا خود خوێندنەوەکەی دووبارە دەکاتەوە، بەپێ میتۆدی ئەزمونی(فرانسیس بیکۆ) میتۆدی دژخی (ئۆگوست کۆنت)، کە لە چەند لایەنێکی دیاری کراوەوە درێژکراوەی ئەزموون دەنوێنێت، ئەم تێکەلّە سروشتی یە دەگمەنە، پێویستیەکانی ئەم بابەتە لێکۆلەنەوەی بەسەردا سەپێنراوە.

چوارەم: وەردی وادەبینێت کە زانسی کۆمەلاّیەتی میتۆدێکە بۆ لێکۆلّینەوەی رۆشنبیری کۆمەلاّیەتی لایەنەکانی رۆشنبیری و ڕۆحی و مادی و(بەها و شێوازی زمان) شیکار دەکات. بە پشت بەستن بە دامەزرێنەرانی زانستی کۆمەلّناسی ئەمریکی(جۆرج مید)، تەنانەت سنوری ئەم زانستەش دەبڕێت. بەدەرچوونی لەسنووری رۆشنبیری

وكارلێكی هێمایی بۆ دامێنی ڕۆشنبیری مادی. وەردی لە مەدا لە(ماكس فیبەر) نزیك دەبێتەوە. پەیوەندی زانستی كۆمەڵناسی ئەمریكی كە نزیكەی حەوت دەیە لە دوایی هاوشێوە ئەورووپی دامەزرا. كەڵەكەبوونی كورتەیەك لە ڕووداوە ڕاستی یەكان بوو، كە گونجاوبوو لەگەڵ قوتابخانە ئەمریكی یەكان، لەنیوەی یەكەمی سەدەی بیستەم دا.ئەمە پەیوەندی بە زانستی كۆمەڵناسی ئەمریكی یەوەهەیە، سودی لێ بینی بۆ تێبینی كردنی ئەو جیاوازیە قوڵەی لەنێوان، كۆمەڵناسی ئەورووپی كە ڕێچكەكانی دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراوە فەلسەفی زمانی یە بەناوبانگەكان و دۆخی ماركسیە ت و بنیادگەرایی یەكان. بەلاّم زانستی كۆمەڵناسی ئەمریكی ڕێچكەكەی بەشێوەیەكی ڕێژەی لەم سەرچاوانەبوو، دۆخی ماركسی و بنیادگەری، تەنانەت فەلسەفەی پراگماتیزمی ئەمریكی، شێوەی زانستی كۆمەڵناسی یە،

شەشەم:ئەم پەیوەندیە ڕەخنەگرانە بە زانستی كۆمەڵناسی بە هەردوو باڵەكەی ئەمریكی و ئەورووپیەوە پاڵی بە(وەردی) ەوە ناوە كە وادابنێت كە هەركۆمەڵگەیەك تایبەتمەندی تایبەتی خۆی هەیە. كە پێویست دەكات لەسەر دامەزراندنی زانستێكی كۆمەڵناسی تایبەت بەخۆی. ئەم ڕێڕەوە تایبەتمەندیە، تەنها لەدایكبوونی فشاری میتۆدی نەبوو، بەڵكو بەرهەمی كاریگەریە سیاسیەكانیش بوو، سەركەوتنی ناسریەكان، بەبیری عەرەبچیەتی یەكەیان و سەركەوتنی باڵە عەرەبە نەتەوەیەكان، وەك بەعسیەكان و ئەوانی دیكە بانگەشەیان دەكرد بۆ دامەزراندنی

کۆمەڵناسی عەرەبی، بەپێی بۆچوونی عەلی وەردی ئەم بانگەشانە ئامۆژگاری بوون نەك توێژینەوەیەکی زانستی. بەڵام ئەوپەڕەنسیپانەی کە عەلی وەردی ئاماژەی پێ کردوون لە بنەڕت دا جێ بەجێی نەکردوون لەنوسینەکانی دا. بەڵك و تەنها ئاماژەپێدانێك بوون پێ یان. بۆ هەرکۆمەڵگەیەك تایبەتمەندی و گشتیەتی خۆی هەیە، هیچ کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگەیەکی دیکە ناچێت. تەنانەت هیچ کۆمەڵگەیەك نی یە لە خودی خۆی بچێت پێش سەدەیەك یان دوو سەدە، تەنها لە چوارچێوەیەکی تەسك دا نەبێت. زۆر ڕۆشنبیری ئەو کۆمەڵگەیە شایەنی سەرینەوەیە لەماوەی ئەو سەدەیەدا. بەڕاستی گرێمانەکانی زانستی کۆمەڵناسی، لە چوارچێوەیەکی نەتەوەی دا کۆبوونەتەوە، وەك وڵاتەکانی(فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئەمریکا) لەماوەی سەدەی بیستەم دا، بەڵام دواتر ئەم نەتەوانە کرانەوە بەڕووی یەکتردا لە کۆتایەکانی سەدەی ڕابردوودا. بۆ ئەوەی پێکەوە شیکاریەکانیان بهێننە ئاراوەو پێشبڕکێ لە یەکخـــستنی شیکاریەکانیان بکەن.

حەوتەم: وەردی لە قوتابخانەی ئەڵمانی( کارل منهاریم) چەند چەمکێکی بنەڕەتی وەرگرتووە، بۆ ڕوونکردنەوە جۆراووجۆرەکانی، شێوازی زانیاری لەناو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکاندا کۆبوونەتەوە، هەروەك چۆن وەك لە(کارل دۆرکهایم)ەوەوە بنچینەکانی گرێمانەی لێکۆڵینەوەی دەوڵەتی نوێی وەرگرت. گرنگتر لەوە پشت بەستنیەتی بە پرەنسیپی

ڕێژەی زانیاری کە ئەمڕۆ بنچینەیەکی بنەڕەتی پێك دێنێت لە بیری دوایی نوێگەری دا.

بەڵام وەردی لە(فەردینان تۆنیس) بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سودی لێ بینەوە بە پشت بەستن بە(ماکیاڤیلی) خاوەنی چەمکی(ناسازی ڕۆشنبیری‌و پێکداداانی ڕۆشنبیری) و جیاکار و دژ بەیەك، لە نێوان کۆمەڵگەی تەقلیدی‌و کۆمەڵگەی نوێی پێشەسازی بەپێی گریمانەی یەکەم:

(فەردینان تۆنیس) ڕێکخەری کۆمەڵەکانە. چەند پەیوەندیکی ڕاستەوخۆ هەیە کە هەستکردنە بە شوێنی جوگرافیایی و کۆمەڵایەتی، ئینیتمابوون‌و پشتبەستن بە دابونەریتە جێگیرەکان وە خێزان و سیستەمی دەسەڵاتداران، بەڵام ئەوی دیکەیان بەرژەوەندیە ئابوریەکانە، ململانێ لەسەر سەرچاوەی ئابوریەکان باڵی کێشاوە بەسەرکۆمەڵگەکان دا، ئەم ململانێ یە بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی دارن بەیەکەوە، بەڵام وەردی ململانێی نێوان تەقلیدی و نوێگەری کۆکردوەتەوە، لە قەفەزی شارستانیەتی خەلدن و دەشتەکیەت دا. پێویستە ئەوە بزانین کە شارستانیەتی ابن خەلدون بەشێوەی دەشتەکیەتە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش نوێگەری.

هەشتەم: لەکۆتای دا وەردی داهێنانی کردوە لەم قۆناغەدا بۆ دەرچوون لە کاریگەریەکانی بیری نەتەوەیی، یاخود بنچینەکانی بیری چەپگەری لە چوارچێوە تەسك و سنوردارەکەی دا، هەروەها بانگەشەی

کرد بۆ کۆمەڵگەیەك کە پشت بە لیبراڵیەتی سیاسی ببەستێت. ئەو سووربوو لەسەر کۆمەڵگەیەك کە دووربێت لە تاك گەرای و کراوەبێت بەڕوی هەموو گریمانەکاندا، تەنانەت گریمانەش دەگۆڕێت بۆ بیروباوەڕێکی ئاینی، لە توێژینەوەیەکەی دا بەردەوام دەبێت. دەچێتە نێوەندی دامەزراوە زانستیەکان کە ملکەچ بن بۆ هێزی دەوڵەت کە دامەڵراون لە ئازادی بیرو لێکۆڵینەوەی ڕەها، ئەم بیروبۆچوونانە تەنها لەلایەن وەردی یەوە داهێنراون.

